الله نور السموات والارض

# چرای ڕووناکی

منتدى إقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

١٣

گۆڤارێکی مانگانەی ئاینی ڕۆشنبیری کۆمەڵایەتی گشتیە

ژمارە (

ڕەمەزانی ١٤٣٠ - کۆچی
گەلاوێژی ٢٧٠٩ - کوردی
ئەیلولی ... نی

## گەورەیی وپیرۆزی: مـانگی رەمەزان

## إيجابيات عباد الرمضان

## چەند وانەیەک لەجەنگی بەدر

## ڕاپۆرتێکی ئەمریکی چاودێری دیاردەیەکی ترسناک دەکات

## حجية الشورى في السنة :

## دایکی صلاح الدین

# هەلوەستە

## سەرنووسەر

## بسم الله الرحمن الرحيم

((يأيُها آلذين ءامَنوا...))

بانگێك بوو پێشتر لە جیهان نەگوترا بوو.

خودای گەورە لە قورئاندا لە چەندان شوێن بانگی ئیمان داران دەكات لە بابەتی جیا جیادا كە پەیوەندیان بە ژیانی ئیمانداران هەیە. هەر حوكمێكیش كە نیدای لە پێش بێت بەڵگەیە لە سەر گرنگی بابەتەكە چونكە بانگ كردن وا دەكات بانگ كراو زیاتر گرنگی بە بابەتەكە بدات، عبدالله ی كوڕی مەسعود دەفەرمووێت:- ئەگەر گوێتان لە قورئان بوو فەرمووی ((يأيُها آلذين ءامَنوا...)) گویی لێ بگرن چونكە یان خێرێكە فەرمانی پێ دەكات یان شەرێكە دەفەرمووێت لێ ی دوور كەونەوە. أبوبكر الجزائری دەفەرمووێت:- (أهيب بكل مؤمن و مؤمنة أن يقرأ هذه النداءات أو يستمعُ إليها فأنها منقذة بأذن الله تعالى من الجهل و رافعة الى أعلى درجات العلم و قوله تعالى ((يأيُها آلذين ءامَنوا...))أمر لمن آمن بالله و رضى به إلهاً و مشرعاً ). كەواتە هەر فەرمانێك ئیسلام بڕیاری لە سەر دابێت بێ حیكمەت نی یە ئینجا ئەو فەرمانە لە بەشی خوا پەرستی بێت یان لە بوارەكانی تری ژیان !خوای گەورە بێ نیازە لە دروست كراوەكانی، خوا پەرستی بەندەكان هیچ لە مولكی خوای پەروەردیگار زیاد ناكات و سەرپێچی كردنیشیان هیچ لە مولكی خوا كەم ناكات، حیكمەت لە گوێڕایەڵی و خوا پەرستی سودو قازانجە بۆ بەندەكان. خودای گەورە سەرەتا لە سوڕەتی (فاتیحە) داوا لە بەندەكان دەكات كە داوی ڕێگەی ڕاست بكەن: ((آهدِنا آلصرٰطَ آلمُستقيمَ...)) لە سوڕەتی (البقرە) وەڵامی مەشخەڵی ئەم ڕێگەیە دیاری دەكات و زۆرترین ئاداب و كارو پێداویستیە سەركیەكانی ژیانی مرۆڤ لەم سوڕەتەدا دیاری دەكات، گومانی تێدا نی یە زیاتر لە هەشتا سوڕەت لە مەككە دابەزیوە هیچیان ئەم بانگە گشتیەیان تێدا نی یە!

((يأيُها آلذين ءامَنوا...))كاتێك دابەزی كە موسڵمانان بون بە خاوەنی زەوی و دەسەڵات و كیانی خۆیان ،جگە لەوەش ئەم بانگە شتێكی نوێ بوو گوێی جەزیرەی عەرەبی لەرزاند بەڵكو دەتوانین بڵێن جیهانی لەرزاند. پێشتر خەڵكان ئەم بانگەشەیان گوێ لێ نەبوو.

بانگ هەر ئەوە بوو (يا بنى فلان ) (يا أهل فلان) یان بە ناوی قەومی، قەبیلە، عەشیرەت، ڕەنگ، تایفەگەری ... هتد.

بەڵام ئەمجارە تە صنیفێكی مرۆڤایەتی بوو بە ناوی ئیمان. ئەم بانگە لە سوڕەتی البقرە دە جار دووبارە بۆتەوە و لە قورئاندا بە گشتی زیاتر لە ٩٠ جار دوو بارە بۆتەوە گشتیان بانگی ئیمانداران دەكەن بۆ جێ بە جێ كردنی فەرمانەكانی خودا تاكو كارو باری ژیانیان ڕێك و تەواو بێت. یەكێك لەم بانگانە بۆ ڕۆژوو گرتنە، بانگەكەش چەند هاندەرێكی تێدایە بۆ ئەوەی موسڵمان پەلە بكات بۆ جێ بە جێ كردنی

أ-بانگ كردنی ئیمانداران بە نیدای ((يأيُها آلذين ءامَنوا...)).

ب- (كتب عليكم) بەڵگەیە لە سەر ئەوەی دەبێ ئەم فەرمانە جێ بە جێ بكری.

ج- (كما كتب على الذين من قبلكم) هاندانە كە تەنها لە سەر تۆ واجب نەكراوە بەڵكو لە سەر ئومەتانی پێش تۆش واجب كراوە.

د-(لعلكم تتقون) هاندانە بۆ سودێكی تر كە ڕۆژوەوان بە دەستی دێنی.

هەر لە م نیدایە دا شتێكیووردمان بۆ ڕوون دەبێتەوە ئەویش خوای گەورە دەفەرمووێت (كتب عليكم الصيام) دیارە خەڵكان گوێڕایەڵی ئەم فەرمانە دەكەن، لە هەمان سوڕەت بە هەمان نیدا دەفەرمووێت:- ((يأيُها آلذين ءامَنوا كُتبَ عليكُمُ القِصاصُ في القتلى...)) لە گەڵ ئەوەش خەڵكانێك هەن بڕوایان بە ئایەتی ڕۆژوو هەیە و بەڵام بڕوایان بە قصاص نی یە و دەڵێن تۆڵە كردنەوە بە تایبەتی كوشتنەوە دەبێ لابردرێت. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت كە بڕوا بە هەندێك و بڕوا نەبون بە هەندێكی تر.

لە كۆتایدا ڕەمەزان قوتابخانەیەكی پەروەردەییە ئیسلام ساڵی جارێك دەیكاتەوە بۆ ئەوەی پەروەردەیەكی عەملی فێری ئیمانداران بكات وەك ئارام گرتن و پاك بونەوەی دەرون و بەهێز كردنی لایەنی ڕۆحی و لابردنی هەرشەی جنسی لە سەر گەنجان و تێر كردنی هەژاران ئەوەی لەم قوتابخانەیە سەركەوت و بێت پاداشتی لێخۆش بون وئازاد بون لە ئاگر وەردەگرێت.

الله نور السموات والأرض

١٣

## بەشی كوردی



## القسم العربى




خاوەنی ئیمتیاز
د. احمد محمد بالیسانی
٠٧٥٠٤٨١٣٢٦٩

سەرنووسەر
م. ئیدریس كەریم كاریتانی
٠٧٥٠٤٨٦٢٧٣٦

ستافی وەلامدانەوەی پرسیاری شەرعی
م. مەلا محمد سلمان پاڵ
شێخ عبدالرحمان بەرزنجی
شێخ ئەحمد بالیسانی

ستافی نوسین
م. اسماعیل ئەجمەدین - م. زرار محمد صادق
م. نادر رەشید - م. تاریق سلێمان - د. یحیامەولود
م. عبدالخالق محمد - م. نیزامەدین یونس - م. خیرالله حسن

بەڕێوەبەری هونەری
بژاری رەئوف ساڵەیی



بەڕێوەبەری هونەری
بژاری رەئوف ساڵەیی



ناونیشان
هەولێر - برایەتی - بەرامبەر
سۆپەرماركێتی كۆڵە
ئاریافۆن: ٠٦٦٢٥٥٩٧٨٥
كۆرەك: ٠٧٥٠٧٠٤٣٢٦١
ئاسیا: ٠٧٧٠٤٣٠٤٠٧٠

chrairunaki@yahoo.com
Www.chrairunaki.com

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ
﴿١٨٣﴾ أَيَّامٗا مَّعۡدُودَٰتٖۚ فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٖ فَعِدَّةٞ مِّنۡ أَيَّامٍ أُخَرَۚ وَعَلَى ٱلَّذِينَ
يُطِيقُونَهُۥ فِدۡيَةٞ طَعَامُ مِسۡكِينٖۖ فَمَن تَطَوَّعَ خَيۡرٗا فَهُوَ خَيۡرٞ لَّهُۥۚ وَأَن تَصُومُواْ خَيۡرٞ لَّكُمۡۖ إِن كُنتُمۡ
تَعۡلَمُونَ ﴿١٨٤﴾ شَهۡرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلۡقُرۡءَانُ هُدٗى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٖ مِّنَ ٱلۡهُدَىٰ وَٱلۡفُرۡقَانِۚ
فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهۡرَ فَلۡيَصُمۡهُۖ وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٖ فَعِدَّةٞ مِّنۡ أَيَّامٍ أُخَرَۗ يُرِيدُ ٱللَّهُ
بِكُمُ ٱلۡيُسۡرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلۡعُسۡرَ وَلِتُكۡمِلُواْ ٱلۡعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُواْ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمۡ
وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴾

**به بۆنەی هاتنی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز، مانگی کردنەوەی دەرگاکانی بەهەشت و داخستنی دەرگاکانی جەهەنەم و بەستانەوەی شەیتانەکان، مانگی ئارام گرتن، مانگی دابەزینی ڕەحمەت و لێخۆش بون و ئازاد بوون لە ئاگری جەهەنەم بە ناوی ستافی گۆڤاری ( چرای ڕوناکی ) پیرۆزبایی خۆمان ئاڕاستەی سەرجەم موسڵمانانی جیهان بە گشتی و موسڵمانانی کوردستان بە تایبەتی دەکەین هەر بەو بۆنەوەش لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی ئە مجارەمان لە سەر ئەم مانگە پیرۆزە دەبێت:**

**١-گەورەیی مانگی ڕەمەزان و ڕۆژی ڕەمەزان.**

**٢-گەورەیی دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزان.**

**٣-ڕۆژمێری مانگی ڕەمەزانی پیرۆز.**

**٤-چەند وانەیەك لە جەنگی بەدر.**

**هەروەها لە بەشی عەرەبی**

**١-إيجابيات عباد رمضان**

**٢-برنامج دعوي خلال شهر رمضان**

**هەموو ساڵێکمان لە گەڵ ڕەمەزان پڕ خۆشی و لەش ساغی بێت.**

نوسینی : زرار گرتکی



# گەورەیی و پیرۆزی :
# مـــانگی ڕەمەزان و ڕۆژوی ڕەمــــەزان

الحمد لله الحنّان المنّان ، الذي منّ على المسلمين بشهر رمضان ، الذي أنزل فيه القرآن ، شهر البركة والرّحمة والغفران .
وأصلي وأسلم على سيدنا محمد رسول الله وحبيبه الأمين ، وعلى آله وصحبه المجاهدين.

**ڕۆژگار دێ و ئەسووڕێتەوە ، هەموو ساڵێك مانگی ڕەمەزانیش لە گەڵ خۆی ئەهێنێتەوە ، مانگی ڕۆژوو گرتن كە پایەێیكە لـە پایـەكانی ئیـسلام ، بناغە و بنچینەیەكە لەو پێـنج بنەمایـە سـەرەكیانەی كـە ئـاینی پـیرۆزی ئیـسلامی لـە سـەر دامـەزراوە . بـۆ زیـاتر شـاناز كردنـی موسـڵمانان بـەو مانگە پیرۆزە ، زیاتر گرنگی و بایەخ پێدانی هەموو لایەكمان بە ڕۆژووگرتنـە كەی ، هەروەها بۆ زیاتر ڕێز لێنان و بە گەورە زانینی مانگی ئوممەتی ئیسلام ، بە كورتی گەورەیی و پیرۆزی ئەو مانگە زێڕینە و ڕۆژوو گرتنەكەی لەم چەند خاڵەی خوارەوە ئاڕاستە بە خوێنەرانی گۆڤـارەكەمان و میوانـانی ئـەو مانگـە ڕێزدارە ئەكەم:-**

## گـــــەورەیی ڕۆژوو

**یەكــــەم : خــوا ڕۆژوو گـرتنــی مانگی ڕەمەزانی فەرز كردیە:-**

خودا بە گەورەیی خوی لـە نێـو قورئـانی پیرۆزدا، ڕۆژ و گرتنی مــانگی ڕەمــەزانی پێویــست كردیــە لــە ســەر هــەموو موسـڵمانێكی ئاقـڵ و پێگەیـشتوو، كـە بشێ ڕۆژوو وەربگرێ و توانـای گرتنیـشی هـەبێت ، خـودا ئەفـەرمووێ : ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ﴾ البقـرە/١٨٣. واتــە : ئــەی ئەو كەسانەی بڕواتان هێناوە ئیمانداركان ڕۆژووتان لە سـەر پێویـست كرا، واتە ڕۆژوو گرتنی مـانگی ڕەمـەزانتان لە سەر فەرزكرا.

(( هیچ گومانی تێدا نیە خێر و پاداشتی فەرزیش گەورەتر و پیرۆز تـرە ، لـە خێـرو پاداشتی ئەو كردەوەو ڕەفتارانەی كە ( فەرزی كفانیە) ، هەروەها لـە تێكـڕای كردوە و ڕەفتارە سوننتەكانیش جگـە لـە چوار پێنج شت بترازێ )) .

لــە فــەرمودەی قودسـیش دا ، خــودا ئەفەرمووێ : { ما تقرب عبدي بشيء احب إلي مما افترضته عليه} ، واتــە : بەنـدەم بـە هـیچ شـتێك لـە مـن نـزك نەكەوتوتەوە خۆشەویستر بێت بەلامــەوە ، لەوەی لە سەرم پێویست و فەرز كردیە .

واتە: بەو كردەوە و ڕەفتارانەی كە فەرزن ، ئـەتوانی زیـاتر خـۆت لـە خـودا نزیـك بخەیتەوە .

**دووەم : خــودا فــەرمانی بــە ڕۆژوو گرتنی مانگی ڕەمەزان داوە:-**

سەرەڕای ئەوەی كە خودا ڕۆژوی ڕەمەزانی فەرز كردوە ، بەمــە لێ نەگـەڕاوە بـەڵكو زیاتر جەحتی لە سەر كـردووو فـەرمان و بڕیـاری (حـەتمی) دەركـردوە ، كـە هـەر كەسێك مانگی ڕەمەزانی بینی و گەیەوە ڕەمەزان ئەبێ بە ڕۆژوو بێت ، لە قورئانی پـیرۆزدا ئەفــەرمووێ :-﴿فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهۡرَ فَلۡيَصُمۡهُ﴾ البقرة/١٨٥. واتە : هـەر كەسێك لـە ئێوە ئامادەی ئەو مانگە بوو مانگی بینی ، یا خرت زانـی كـە دیـتراوە و ڕەمـەزان هاتووە با ئەو كەسە ڕۆژووەكەی بگرێ .

**سێ یەم : هەموو ئەتەوەیەكی سەر زەوی جۆرە ڕۆژوو گرتنێكی هەبووە و هەیە :-**

هــەر لــە بابــە ئادەمــەوە تــاكو محمـد المصطفی ( سـەلامی خـوا لـە سـەر هەموانیان بێت ) جۆرە ڕۆژوو گرتنێكیان هەبوە !!

خوای پەروەردیگار لەم بارەیەوە ئەفەرمووێ : ﴿...كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ...﴾ البقرة/١٨٣.

واتە : هەروەکو لە سەر خەڵکی بەر لە ئێوەیش ڕۆژوو فەرز کرابوو ، ئاواش لە سەر ئێوە فەرز کراوە .

ئا ئەوە پێغەمبەری خواش ﷺ لە بارەی ڕۆژوو گرتنی پێغەمبەرانی خوا (سەلامی خوایان لە سەر بێت) ئەفەرمووێ :

{ نوح سەلامی خوای لە سەر بێت چوار وەرزی ساڵ بە ڕۆژوو بووە ، تەنیا لە ڕۆژانی جەژن نەبێت ، داود سەلامی خوای لە سەر بێت نیوەی ساڵ بە ڕۆژوو بوە ، ئیبراهیم سەلامی خوای لە سەر بێت سێ ڕۆژ لە هەموو مانگێ بە ڕۆژوو بوە ، چوار وەختی ساڵ وەکو بە ڕۆژوو بوبێت و پێ نەبوو بێت ئاوا بووە } باسادحسن .

**چوارەم : خودا ڕۆژووی تایبەت کردوە بە خۆی :-**

عبدالرحمن ئەگێرێتەوە ئەڵێ : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : { خودای پەروەردگار فەرمووی : هەموو کردوەی ئادەمیزاد بۆ خۆیەتی ، تەنیا ڕۆژوو نەبێ ، ڕۆژوو بۆ منە...} بخاری و مسلم .

خوای پەروەردگار بۆیە کردەوەی ڕۆژووی داواتە پاڵ خۆی و جیای کردیتەوە لە هەموو کردوەکانی تر، چونکە : (( ڕۆژوو کارێکی نهێنیە لە نێوان خودا و بەندە ، مرۆڤ ئارەزووی لێ بێت کەس بەو نهێنیە ئاگادار نابێت .

لە لایەکی تریش مرۆڤ لە پێناو خودا ، واز لە هەموو ئارەزوەکانی هی ورگ و دامێنی دێنێ و ، دەرونیشی پاك ئەکاتەوە ، بێ پێویستیش لە ئارەزوەکان لە ڕەوشتەکانی خودایە .

هەروەها بە ڕۆژوو: جگەلە خودا، کەس و شتێتر نە پەرستراوە ، بە پێچەوانەی کرنوش بۆ بردن و خێر بۆ کردن و یاد کردنی ، لە هیچ چەرخێك کافرەکان ڕێزیان لە پەرستراوێك نەناوە و بە ڕۆژوو بۆ گرتن ، بەم کردەوەیە گەورەیان نەکردووە ، ئەمەشمان لە بیر نەچێ کە ڕۆژوو دوورە لە ڕواڵەت و ڕیابازی ، وەکو نوێژ و حەج و چاکە کردن و جیهاد بە ئاشکرا ناکرێ .

**پێنجەم : خودا پاداشتی ڕۆژووی دیار نەکردیە :-**

ڕاستە هەر کەسێ کردوە وە ڕەفتارێکی باش بکات بچوك بێت یا خوت گەورە ، هەر خودایە تۆڵە و پاداشتمان لە سەریەوە بداتەوە ، بەڵام زێدە لە هەموو کردوەکان خودا ئاماژەیەکی تایبەتی بە ڕۆژوو کردیە ، لە فەرموودەی قودسیدا هاتوە خودای باڵا دەست ئەفەرموێ : {... هەر خۆم پاداشتی ڕۆژوو ئەدەمەوە} .

لە ڕوایەتێکی تری ئیمام موسلم : پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێ : {هەموو کردوەی ئادەمیزاد چەند قاتی خۆی ئەکرێتەوە ، چاکە دە هەندی خۆیەتی یەك بە دەیە تاکو حەوت سەد هێندەی خۆی ، خودای عز و جل ئەفەرمووێ : تەنیا ڕۆژوو نەبێت ، ڕۆژوو بۆ منە و هەر خۆم پاداشتی ئەدەمەوە... }. خودا بفەرمووێ : هەر خۆم ئەزانم چ پاداشتێکی لە سەر ئەدەمەوە ، کار بە حەوت سەدیەوە نیە ، بێ ژمارە پاداشتی لە سەر ئەداتەوە ، یا ڕەبی خودایە لەو موژدەیە بێ بەشمان نەکەی .

**شەشەم : ڕۆژوو پارێزەرە ، قەڵغانە :-**

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەفەرمووێ : خودا ئەفەرمووێ : { والصيام جنة } بخاری .

واتە : ڕۆژوو پارێزەرە ، پارێزەر لە چی ئەی پێغەمبەری خودا؟ عوسمانی کوڕی عاصی خوای لێی ڕازی بێت ئەفەرموێ : گوێم لە پێغەمبەری خوا بوو ئەیفەرموو :

{ ڕۆژوو پارێزەرە لە ئاگری وەکو خۆ پارازتنی یەکێك لە ئێوە لە شەڕی } صحیح . نەك هەر پارێزەرو بەس ، بەڵکو ڕۆژوو هەروەك پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەیەکی تر لە بارەیە وە ئەفەرمووێ : { ڕۆژوو: پارێزەر و قەڵاتێکی پۆڵاینە لە ئاگر } صحیح .

بەڵێ ڕۆژوو پەردەیە لە نێوان تۆ و ئاگری دۆزەخ ، بەو مەرجەی : ئەو پەردەیەی نەدڕێنێ بە گوناح و تاوان ، قەڵاتی پۆڵایینە بەڵام بەو مەرجەی : کونی نەکەی بە تاوانەکانی دەست و زوبانت ، هەروەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی :{الصيام جنة مالم يخرقها } .

**حەوتەم : ڕۆژوو گوناهەکانی ڕابردوو ڕادەماڵێ :-**

توخودا کردەوەیەك بێت هەناوەکان بە تاڵ بکات ، لێوەکان وشك بکات و تێکرای ئارەزوەکان کپ بکات ، چۆن گوناهەکانیش تەفرو تونا ناکاتن ؟! بەڵێ ئائەوە بوخاری و موسلیم بۆمان ئەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: { هەر کەسێك بە نیاز و باوەڕێکی پاکەوە مانگی ڕەمەزان بە

رۆژوو بێت ، بە ئومێدی پاداشتی خوا و لێشی بێزار نەبێ ، خودا لە گوناحەکانی ڕابردووی خۆش ئەبێت } .

لە فەرموویەکی تری ئیمامی موسلیم ، لە پێغەمبەری خوایەوە ﷺ ئەفەرمووێ : { پێنج نوێژەکان ، هەینی بۆ هەینی ، ڕەمەزان بۆ ڕەمەزان ، ڕامالێنەری نێوان خۆیانن ، ئەگەر دوورە پەرێزی گەورەکان بێت }. واتە : ئەو ڕەمەزانە بۆ ڕەمەزانێکی تر ، هەر دوکیان گوناهو تاوانی نێوا خۆیان ئەشۆرێنن ، بەلام بەو مەرجەی : خۆی لە گوناهە گەورەکان پارستبێت ، بە ڕاستی غەسل و تەشحیمە ! بەڕاستی ئەوەیە گەرماوی پاك کەرەوەی چڵکی گوناهو تاوان ! گەرماوت پیرۆز بێت ئەی ڕۆژووگری مانگی ڕەمەزان .

**هەشتەم : ڕۆژوو هەفتا پایزە پێ لە ئاگر دوورت ئەخاتەوە:-**

ڕۆژوو وەك خەندرێکی بە ئەندازەی نێوان ئاسمان و زەوی یە لە نێوان تۆ و ئاگری دۆزەخ !!

لە باوکی سەعیدەوە ئەلێ : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : { هەر بەندەیەك ڕۆژێك بە ڕۆژوو بێت ، لە پێناو خوداو بە دڵسۆزیەوە ، خودا بەو ڕۆژەی دەمو چاوی ئەو کەسە حەفتا ساڵە ڕێ هەر دوو ئەخاتەوە لەئاگر } بخاری .

لە فەرموودەیەکی تری (حەسەن) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی : { هەر کەسێك ڕۆژێك لە پێناو خودا پێ بێت ، خودا خەندرێك ئەخاتە نێوان ئەو و ئاگر ، هەر وەکو نێوان ئاسمان و زەوی } .

ئەوە ڕۆژێکی ڕەها و (مطلق) ئەو بەرگریەت لێ بکات ، بە ڕوژوو بوونی ڕۆژێك لە جیهادا ئەو کاریگەریەی هەبێت !! ئەدی ڕۆژوی فەرز ؟ ئەدی بە ڕۆژوو بوونی مانگێك لە سەر یەك وەك مانگی ڕەمەزان ؟ بەڵکو ئەوەندو سەدان ساڵە ڕێتر مرۆڤەکە دوور ئەخاتەوە لە گڕو گەرمای دۆزەخ .

**نۆیەم : ڕۆژوو تکا کارە لە ڕۆژی دوایی :-**

لە عبداللە ی کوری عەمر (ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێ بێت) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی :

{ ڕۆژو و قورئان تکا ئەکەن و ئەپاڕێنەوە بۆ بەندە لە ڕۆژی قیامەتا ، ڕۆژوو بە زبان حالی ئەلێ : ئەی پەروەردیگارا من خواردن و خوادنەوە و ئارە زوەکانم لەو بەندەیە قەدەغە کردبوو ، بم کە بە شەفیع و تکا کار بۆی ، قورئانی پیرۆزیش ئەفەرموێ : منیش بە شەو خەوم لێ قەدەغە کردبوو ، بم کە بە شەفیع و تکا کار بۆی ، پێغەمبەر فەرمووی : هەردوو کیان تکا و شەفاعەت ئەکەن

ـ تکاو شەفاعەتیشیان قەبووڵە ـ } حسن .

*خۆزێنەری بەرێز و میوانی مانگی ڕەمەزان*

: ناخۆشترین ئازار و ئیش و ئەشکەنجەی قیامەت تینوەتیە ، چونکە پلەی گەرمی لە ئەندازە دا نیە ، ئەوەندە گەرمە ، ئەوەندە گەرمە ئەو خۆرەی "ڕۆژەی" کە بە سەد و پەنجا " ١٥٠ " ملیون کیلۆ مەتر لە زەوی و ئێمەوە دوورە ، لەوێ دووری یەکەی بە پێی فەرموودەیەکی پێغەمبەر _صلى الله عليه و سلم_ لە دوو کیلۆ مەتر کەمترە ، سبحان الله لەو گەرمیە !! یا ڕەبی خودایە بمان پارێزی .

ئینجا ئازیزم وەرە لە ئێستاوە کونەئێك ئاو بۆ ئەوێ مسۆگەر بکە ، گوێ بگرە بۆ ئەو فەرموودە (حەسەنە)یە : { عبداللە ی کوری عەباس بۆمان ئەگێڕێتەوە ئەفەرمووێ : پێغەمبەری خوا ﷺ (سریەیکی) پەلێکی دەریایی بە سەرپەرشتی باوکی موسی ڕەوانە کرد ، ئەوان لەوێ لە شەوێکی تاریکا کە پەردەی کەشتیەکەیان هەڵدابوو دەنگێك لە سەریانەوە بانگی کردن : ئەی خەلکی کەشتیەکە ڕاوەستن ، تاکو بڕیارێکی خوداتان پێ بڵێم کە بڕیاری لە سەر خۆی داوە ، باوکی موسی فەرمووی : ئەگەر خەبەرێکت پێ یە پێمان بڵێ : فەرمووی : خودای پەروەردیگار بڕیاری داوە لە سەر خودی خۆی : لە ڕاستیدا هەر کەسێك لە ڕۆژێکی گەرما خۆی بۆ خودا تێنو بکات ، تێراوی ئەکات لە ڕۆژی تینوەتی } حسن .

**دەیەم : ڕۆژوو گرتن تەندروستیە :-**

ئەبو هورەیرە بۆمان ئەگێڕێتەوە ئەفەرمووێ : پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : {صوموصحوا..} حسن.واتە : بە ڕۆژوو بن لەش ساغ ئەبن و تەندروستیتان باش ئەبێت . دەوەرە بابچینە نێو گەورە دەرمانخانەی پێغەمبەری خوا !!

**باپێکەوە بچینە نێو گەورە ترین خەستەخانەی ئیسلامی !!**

**کۆمەڵگای پزیشکی و کۆگای دەرمانی ڕەمەزان .**

زۆر لە زانا گەورەکانی تەندروستی ، پزیشکە پسپۆر و پرۆفیسۆرەکانی جیهانی ، یەکجار زۆریان لە سەر سوودو قازانجی ڕۆژوو نوسیوە ، ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ

پاڵپشتی فەرمودودەی پێغەمبەریان کردوە ، بۆ نمونە وەك مشتێك لە دەریایێك :

أ- دکتۆر " فرید ریك هوفمان " ی ئەلمانی ئەلێ : ڕۆژوو یاریدە دەرە بۆ چارەسەری (صرع) پەرکەم و قورحە و سەرەتانی خوێن و وەرەمی پووك .. هتد .

ب- دکتۆر " زیلاندی " رووسی ئەلێ : ڕۆژوو کاریگەرێکی گەش بینی هەیە لە سەر کۆئەندامەکانی مێشکی نەخۆش ، هەروەها کاریگەریەکی باشی هەیە لە سەر هەرس کردن و خوێن و تەندروستی بە شێوەیەکی گشتی .

ج- دکتۆر " ئیدوارد دێوی " لە ولایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا ، بە ڕوژوو چارەسەری شلە ژانی گەدە و ریخۆڵۆکەو دەردی ڕشانەوە و هەمو جۆرە ئیلتهابات و خاوی و بێهێزی جەستەی کردوە .

د- دکتۆر " ماك فادۆن " لە زانایانی تەندروستی ئەمریکایە لە کتابەکەی لە سەر ڕۆژوو ئەلێ : هەموو مرۆڤێك پێویستی بە ڕۆژوو هەیە با نەخۆشیش نەبێت ، چونکە مادەی ژەهراوی خۆراك و داوو دەرمان لە جەستەی مرۆڤ کۆئەبێتەوە ، وەکو نەخۆشێکی لێ دەکات لاشەی گران ئەکا و چالاکی کەم ئەکاتەوە ، ڕۆژوو ئەوەی ڕابردوو لائەبات .

هـ- دکتۆر " ئیدوارد بوی " ئەمریکی ئەلێ : هیچ دەردێك و نەخۆشیەك نیە بەرامبەر بە ڕۆژوو هێزی دانەبەزێ ، هەر زەبون ئەبێ ، ئەوە بیست و شەش ساڵێشە ( ٢٦ ) من چارەسەری نەخۆشەکان بە ڕۆژوو ئەکەم و ، ئامۆژگاریان ئەکەم بە واز هێنان لە خواردن ، تا تەندروستیان بۆ ئەگەڕێتەوە .

و- " کارلۆی " ناوداری ئەمریکیش ئەلێ : واز هێنان لە خواردن بۆ ماوەیەکی دیار کراوو هەموو ساڵێ ، ئەرکێکی تەندروستیە و فەرزە و پێویستێکی پزیشکیە ، ئینجا ڕۆژوو گرەکە چ دەوڵەمەند بێ یان هەژار ، چونکە : هەمە جۆری میکرۆبەکان خۆراکی زۆریان هەیە لە نێو جەستە و گەشەش ئەکەن ، بەڵام : بە ڕۆژوو بێهێز و پووچەڵ ئەبن . هەروەها " کارلۆ " ئەلێ : *ئایینی ئیسلام چاکترین دینە کە ڕۆژووی فەرز کردیە ، محمدیش کە بەو ئایینە هاتوە چاکترین دکتورە ، بە پێی ئامۆژگاریەکانی چونکە : فەرمان ئەدات بە خۆ پاراستن پێش ئەوەی نەخۆش بکەوی*

ز- پرۆفیسۆری دەروونی و کۆمەلاتی دکتۆر " ڕولاند کراهی " لە پەیمانگای " داروك مون " پاش لێکۆلینەوەیەکی زۆر لە عیاداتی " بوشینجر " ی ناوداری پزیشکی ئەڵمانی و ئەسپانی گەیشتۆتە ئەم ئەنجامە : پێویستە سەر لە نوێ پلەی ڕۆژوو بەرز بکەینەوە، بۆ ئەو پایە بەرزەی کە لە چەرخە کۆنەکانی هەبوە، ئەویش ئەوەیە کە ڕۆژوو لە سەروی پزیشکیەوەیە و، ئەبێ بە هەند هەڵبگیرێ چونکە کارێکی پێویستە و ژیان ئەیخوازێ .

ئیتر لەم بارەیەوە دەیان کتاب دانراوە، بۆنمونە :١) صومواتصحوا . د. محمد عثمان . ٢) صومواتصحوا . د. حسان باشا . ٣) الصيام والصحة . د. راجي التكريتي . ٤) الصوم الشافي . د. ديفه . ٥) التطبب بالصوم . د. ألكسس سوفرين . ٦) الصوم الطبي . د. آلان كوت . ٧) رمضان . للأستاذ سعيد العريان . ٨) الطب الحديث يرسم خطى الإسلام . دەیان پەرتووکیتر لەم جۆرەو

بەڵکو سەرچاوەی باشتریش ، بۆ زیاتر سوود وەرگرتن بگەڕێ وە سەریان.

**یازدەم : ڕۆژوو هاوتای نمونەی نیە:-**

باوکی ئومامە ئەگێڕێتەوە ئەلێ : گوتم : ئەی پێغەمبەری خوا فەرمانم پێ بکە بە کارێك ، فەرموی :{ دەست بە ڕۆژوەوە بگرە ، ڕۆژوو هاوتای نیە } ، دیسان گوتم : فەرمانم پێ بکە بە کارێك ، فەرموی : { ڕۆژوو بگرە هاوتای نیە } ، دووبارە گوتم :

فەرمانم پێ بکە بە کارێك خودا سوود و قازانجم پێ بگەیێنێ ، فەرمووی : {ڕۆژوو بگرە دەست بە ڕۆژوە وە بگرە هاو وێنەی نیە } ، لە ڕواتێکی تر ئەلێ گوتم : ئەی پێغەمبەری خوا کارێکم نیشان بدە پێ ی بچمە بەهەشت فەرمووی :

{ عليك بالصوم فإنه لا مثل له } ، بۆیە لە مالی باوکی ئومامە بە ڕۆژ دووکەڵ نە ئەدیترا ، مەگەر میوانیان هاتبا ! صحيح .

خوێنەری بەڕێز و میوانی مانگی ڕەمەزان : ئەمە و چەندین بەرزی و پیرۆزی و گەورەیی تری ڕۆژوو لە سەروی هەمووش : خۆی لە خۆیدا بنچینە و پایەیێکە لە بناغە و بنەمایەکانی ئیمان و ئیسلام ، لێرەدا ئەوەی شایانی زیاتر باسکردنی بێت : هەر ڕۆژوو ئەو ڕێز و پایەی نیە بە تەنیا و بەس ، بەڵکو مانگی ڕەمەزانیش هاوشان و هاوتای ڕۆژوو گەورە و پیرۆزە بۆ نمونە :

## گەورەیی مانگی ڕەمەزان

**یەکەم/ مانگی قورئانە ، مانگی تێدا هاتنە خوارەوەی سروش و وەحیە**

**بۆ پێغەمبەران( سەلامی خوایان لە سەر بێ ) :-**

خوای پـەروەردگار ئەفـەرموێ : ﴿ شَهۡرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلۡقُرۡءَانُ هُدٗى لِّلنَّاسِ ...﴾

البقـرە:١٨٥. واتـە : ئـەو ڕۆژە دیـار کراوانەی کە پێویستە تێیدا بە ڕۆژوو بـن لە مانگی ڕەمەزانە ، ئەو مانگـەی ئـەو تۆ کە قورئانی تێدا هاتوتە خـوارێ ، بـۆ هیدایەت و ڕێنومـایی و شـارەزا کردنـی خەڵکی .

لە سەرتای سورەتێکی تردائەفەرموێ : ﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ﴾ القدر/ ١ . واتە : ئێمە قورئـانی پیرۆزمـان لـە شەوی بـەرز و بـەرێز و پـیرۆزدا ناردۆتـە خوارێ ، شتێکی بەڵگە نەویستیـشە کـە شەوی قەدر لە نێو ڕەمەزاندایە .

نەك قورئانی پیرۆز و بەس ، بەڵکو کتاب و نامـەیتریش کـە بـۆ پێغەمبـەرانی تـر هاتوەتە خوارێ ، ئـەمیش هـەر لـە نێـو ڕەمەزانیـــدا بـــوە ، ئـــا ئـــەوە لـــە فەرموودەیـەکی (حەسـەن) پێغەمبـەری خـــوا ﷺ ئەفـــەرمووێ : { نامـــەکانی ئیـبراهیم لـە هـەوەڵی شـەوی ڕەمـەزان دابەزینـدراون ، تـەوراتیش لـە شەشـی ڕەمەزان دابەزێندرا ، ئینجلیش لـە سـێ زدەی ڕەمەزان دابەزێندرا ، زەبـوریش لـە هەژدەی ڕەمـەزان دابەزێنـدرا ، بیـست و چـوار ڕابردبـوو لـــە ڕەمـــەزان قورئـــان دابەزێندرا }.

**دووەم/ هەر لە مانگی شەعبانەوە پێغەمبەری خوا " پێش وازی لە مانگی ڕەمەزان ئەکرد،**

**خۆشحاڵی خۆی بە هاتنی ئەو مانگە دەر ئەبڕی :-**

لە فەرموودەیەك دا پێغەمبـەری خـوا ﷺ بە هاتنی مانگی ڕەمەزان مزگێنـی دەدا یاوەرەکان و ئەیفـەرموو : { قد جاءكم رمـضان شـهر مبـارك إفـترض الله عليكم صيامه...} صحیح . واتـە : لـە ڕاستیدا وا مانگی ڕەمەزانتان بـە پـیرۆزە هـات ، مـانگێکی پـیرۆزە ، خـودا ڕۆژوو گرتنەکەی لە سەر ئێوە فەرز کردوە .

لە فەرموودە یەکیتردا ئەفـەرموێ : { وا ڕەمـەزانتان هـات ، مـانگی پـڕ پیـت و بەرەکەت ، خودا بە ڕەحمەتی خۆی دەورتان ئـەدات ، سـۆز و ڕەحمـەتی خـۆی دا ئەبەزێنی ، گوناهان هەڵئەوەرێنی ، دوعا و پاڕانەوەی تێـدا قـەبوول ئـەکات ، بـە چاوی ڕەحمەت تەماشای پێش برکێی ئێوە ئەکات ، خۆی بە ئێوە لە سەر مەلائکەتە کـان هەڵئەکێشی !! بـە باشـە و خێـر، خۆتان نیشانی خودا بـدەن ، بـەد بـەخت ئەو کەسەیە بێ بـەش بـێ لـە ڕەحمـەتی خودا لەو مانگەدا } حسن .

سـەلمانی فارسـی بۆمـان ئەگێڕێتـەوە و ئەفەرمووێ : لە کۆتایی ڕۆژانی شەعبان پێغەمبەری خوا ﷺ وتـارێکی بـۆ دایـن فەرمووی : { ئەی خەڵکینە لە ڕاسـتیدا مانگێکی گەورە و پیرۆز لێتان نزیك بووەوە و بەپیرتانـەوە هـات ، وەك سـێبەرێك سـێبەرتان لێ ئـەکات ، ئـەو مانگـە مانگێکـە هەوڵەکـەی ڕحمەتـە ، نێـوە ڕاستەکەی لێخۆشبوونە ، دووایەکەشـی ئازاد بوونە لە ئاگری ، هەر کەسێك لـەو مانگەدا ئەرکی کوبیلەکەی سوك بکات ، واتە: ئەرکی خزمەت کارو شاگردەکانی ئاسان بکات کاریان سوك بکات ، خودا لێی خۆش ئـەبێ و لـە ئـاگریش ئـازادی ئەکات ...} .

**سێ یەم/ دەرگا کانی پیرۆز و بـەرێزی تێـدا ئەکرێنـەوە و واڵا ئەکرێن :-**

بوخـاری بۆمـان ئەگێڕێتـەوە، کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی : {ئەگـەر ڕەمـەزان هـات ، دەرگاکـانی بەهەشـت ئەکرێنـەوە و واڵا ئـەکرێن ...} لـە فەرموودەیـەکی تـر ئەفـەرموێ : {ئەگەر بوە هەوەڵ شەوی مانگی ڕەمەزان ... دەرگاکانی بەهەشت ئەکرێنەوە و واڵا ئەکرێن ، یەك دەرگای لێ داناخرێ ، جـاڕ کار بانگەوازی ڕادێڵێ و ئەڵێ : ئەی خێـر خواز وەرە پێش ...} .

لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئەفەرموێ : { ئەگەر ڕەمەزان هات ، دەرگاکانی ڕەحمەت ئەکرێنەوە ...} مـسلم . عبـدالرحمن یـش بۆمـان ئەگێڕێتـەوە و ئەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : {وا مانگی ڕەمەزانتان هات مانگێکی پیرۆزە ، دەرگاکانی ئاسمانی تێدا ئەکرێنەوە ... } حسن .

عبـــدالله کـــوڕی مەســـعودیش لـــە پێغەمبـەری خـوا بۆمـان ئەگێڕێتـەوە فەرموویەتی : { کـە بـوە هـەوڵ شـەوی مـانگی ڕەمـەزان ، دەرگاکـانی هـەموو بەشەکانی بەهشتی تێدا ئەکرێنەوە و واڵا ئەکرێن ، یـەك دەرگـای لێ دانـاخرێ بـە درێژای مانگەکەی هەر هەمووی ـ هەتا دوایین شەوی ڕەمەزان ـ ) حسن .

**چوارەم/ هەمە جۆری دەرگاکانی شەڕ و سزای تێدا دائەخرێ :-**

تـا ئـەوە پێغەمبـەر ﷺ ئەفـەرمووێ : {ئەگـەر ڕەمەزان هـات دەرگاکـانی جەهەننەمی تێدا دا ئەخرێن } مسلم.

نەك هەر دەرگا سەرەکیەکانی داخرێن ، بەڵکو دەرگاکانی نێوە وەی ئاگریشی تێدا دائەخرێن : { غلقت أبواب النار } بخاری.

هەروەها ئەفەرموێ : { لـە گـەڵ هـەوڵ شـەوەی مـانگی ڕەمـەزان هـەر هـەموو دەرگاکـانی ئـاگر دائـەخرێن و قـەپات ئەکرێن ، یەك دەرگاشی لێ ناکرێتـەوە ... جـار کـاریش بانگـەوازی ڕادێڵـێ و ئەفەرمووێ : هەی شەڕ خـواز واز بێنـە } حسن .

بەڵێ هەر لە گەڵ یەکەم شـەوی مـانگی ڕەمەزان هەتا دواین شەوەکەی ، تێکرایی دەرگاکـانی دەرەوە و نـاوەوە داخـراوون ، بانگەوازیش بۆ ناحەزانی ڕەمەزان ڕادێڵن و ، پێیان ئەگوترێ : هەی مرۆڤـی شـەڕ خواز و خراپ وازبێنە و دەست هـەڵگرە و بەرچاوت ڕووناك بکە .

**پێنجەم/ تێکرایی شەیتانەکان و جنۆکە شەڕ خواز و شڕیرەکان تیایدا زنجیر بەست ئەکرێن :-**

پێغەمبـەری خـوای ﷺ ئەفـەرمووێ : { ئەگەر ڕەمەزان هـات ، شـەیتانەکان بـە زنجیر ئەبەسترێنەوە } بخاری .

لە فەرموودەیەکی تر ئەفەرموێ : { زنجیر بەسـت ئـەکرێن } مـسلم . هـەروەها ئەفەرمووێ : { ئەگەر بوە یەکەم شـەوەی مـانگی ڕەمـەزان ، شـەیتانەکان زنجـیر بەست ئەکرێن ، هەروەها جنۆکە تونـد و شەڕ خوازە لە خۆبایی بوەکانیش } .

نافەرین بۆ ئەو کەسەی ئەو شـەیتانە شەڕ خوازو ، ئەو جنۆکە توند تیژانە ، لە خۆی بـەر نـەدات !! بـە خـۆی بـە دەم و دەستی خۆی نەچی زنجیرەکانیـان بکاتـەوە لە گیانی خۆیان بەربدات .

**شەشـەم/ مـانگی ڕەمـەزان ئەتکێڕێتەوە بۆ تەمەنێکی تازە لە دایک بوو !! پاك و بێگەرد:-**

لە عبدالرحمن ی کوڕی عەوفیەوە (خوا لێ ڕازی بێـت) فەرموویـەتی : پێغەمبـەری خوا ﷺ باسی گەورەیی ڕەمەزانی کرد بـە سەر مانگەکانی تردا ، دواتر فـەرمووی : { خـوداڕۆژوی ڕەمـەزانی لەسـەر ئێـوە فەرزکرد ، منیش قیامەکەیم بۆ گێـراون بە سوننەت ،

ـ واتە : خودا ڕۆژوی لە سەرتان دانـاوە ، منیش تەراویحم بۆ داناون ـ هەر کەسێك بـە ڕۆژوو بێـت ، بـە ئـەرکی تـەراویحش هەڵستێ بە ئیمان و باوەڕەوە ، هەروەها بە ئومێدی پاداشتی خـوا ، ئـەو کەسـە لـە گوناهەکانی دەر ئەچێ و پاك ئەبێتـەوە ـ وەك ئەو ڕۆژەی لە دایك بوبێـت ئـاوای لێ دێتەوە } . لە فەرموودەیەکی تـر: ئـەبو هورەیرە بە کەعبی گووت : ڕەمەزان لای ئێـوە چـۆنە ؟ فـەرمووی : ڕەمـەزان لای ئێمـە هـەڵ وەرێنـەرە ، گـووتی : لـەم بارەیەوە پرسیارت لە پێغەمبەری خـوا ﷺ نەکردیە ؟ ئەبو هورەیرە گوتی : بەڵێ .

گـوێم لێ بـوو ئەیفـەرموو : { هـەر کەسێك مانگی ڕەمەزان بە ڕۆژوو بێـت ، زیندووشی بکاتەوە ـ واتـە : تـەراویحی تێدا ئەنجام بدات ـ بە باوەڕ و بە ئومێدەوە ، ئـەوە لـە گوناهـەکانی ڕابـردووی ئەبووردرێت و خودا لێ ی خۆش ئەبێت } باسناد لا بأس به .

**حەوتەم/ شەوێکی تێدایە بە درێژای تەمەنت بەڵکو زیاتریش :-**

ئەنـەس ئەفـەرمووێ : ڕەمـەزان هـات پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : { ئا ئەوە ئـەو مانگـەتان ئامـادە بـو ، شـەوێکی تێدایە چاکترە لە هەزار مانگ ، کەسێك لێ بێ بەش بێ ، بـێ بەشـە لـە هـەموو خێرو بێرێك ، بێ بەشیش نابێت لەم خێرو بێرەی ئەم شەوە ، تـەنیا کەسێك نـەبێت کە بێ بەش کراوە } حسن .

ئەبو هورەیرە ئەفـەرمووێ : پێغەمبـەری خـوا ﷺ فـەرمووی : { خـودا شـەوێکی هەیە لە ڕەمەزانا چاکترە لە هەزار مانگ ، کەسێك لێ بێ بەش بێت لە ڕاستیدا بێ بەش بوە } حسن .

بە ڕاستی ڕێزێکی وای هەیە ئەم شەوە بار تـەقای هـەموو ڕەمەزانـە و زیـاتریش !! چونکە : بەرامبـەر ڕەمـەزان پێغەمبـەر فەرموویەتی : { هەر کەسێ ڕەمەزان بـە ڕۆژوو بێـت خـوا لـە گونـاهی ڕابـردووی خـۆش ئـەبێت } ، بـە هـەمان شـێوەش بەرامبەر ئەم شەوە ئەفـەرموێ : { هـەر کەسـێك شـەوی قـەدر و پـیرۆز زینـدوو بکاتەوە بە بـاوەڕێکی پـاك و ئومێـد بـە پاداشـتەکەی ، خـودا لـە گوناهـەکانی ڕابردووی خۆش ئەبێت } بخاری .

پێش ئەوەی پێغەمبەریش ﷺ ئـەو ڕێـز و پیرۆزیە بداتـە ئـەم شـەوە ، خـودا ڕێـزی زیاتری بۆ دانا بو ، پلە و پایەی بەرز تـر کردبو ، قورئانی تێدا دابەزاندوە ، بەڵێ خێر و پاداشتی چـاکترە لـە هـی هـەزار مانگ ، مەلائیکەتـەکانی خـودای تێـدا دائەبەزن لە سەروی هەموویانەوە جبریـل ( علیه السلام ) ، شەوی ئاشـتی و ئارامیـە هەروەکو پەروەردیگار لە قورئانی پـیرۆزدا

سوڕەتێكى چكۆڵەى بە نـاوى ئـەم شـەوە تۆمار كردوە و ناوى ناوە : ( سورة القدر ) ئەفەرموێ :

﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَـٰهُ فِى لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ۝١ وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ ۝٢ لَيۡلَةُ ٱلۡقَدۡرِ خَيۡرٌ مِّنۡ أَلۡفِ شَهۡرٍ ۝٣ تَنَزَّلُ ٱلۡمَلَـٰٓئِكَةُ وَٱلرُّوحُ فِيهَا بِإِذۡنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمۡرٍ ۝٤ سَلَـٰمٌ هِىَ حَتَّىٰ مَطۡلَعِ ٱلۡفَجۡرِ ۝٥﴾ .

**هەشتەم/ هیچ سات و شوێن و ڕۆژگارێك نیە وەكو ڕەمەزان خەڵكى تێدا ئازاد بكرێ ،**

**مانگى ڕزگار بونى خەڵكە لە كڕ و گەرماى ئاگرى دۆزەخ :-**

باوكى ئومامە ئەگێڕێتەوە لە پێغەمبەرى خوا ﷺ فەرموویەتى : { لە كاتى هـەر بـەربانگ كردنەوەیـەك – كـاتى فتـار كردنەوە- خـوداى ( عـز و جـل ) چـەند ئازاد كراوێكى هەیە } حسن .

عبـدالله كـوڕى مەسـعودیش لـە پێغەمبـەرى خـوا ﷺ ئەگێڕێتـەوە كـە فەرموویەتى : { لە كاتى هـەموو فتـار كردنەوەیەكى مانگى ڕەمـەزان ، هـەموو شەوێك خودا ئازاد بووى هەیە لە ئـاگرى شەست هەزار كەس !! ـ چونكە : چاكە ، یەك بە دەیە ، بە هەر ڕۆژێـك لـەكاتى فتـار كردنـەوە ( ١٠ ) دە ئـازاد كـراوى دۆزەخ هەیـە !! لـە هـەر شەوێكیـشا لەكاتى پارشێو خواردن ( ١٠ ) دە ئازاد كراوتر هەیە !! ـ لە ڕۆژى جەژنیـشا بـە قەد ئەوەندەى لە مانگەكە خەڵكى ئـازاد بـووە ، ئەوەنـدەى تـریش شەسـت هـەزار شەست هـەزار خـەڵكى ئـازاد دەكـات } حسن .

**نۆیەم/ مانگێكە چاكەى تێدا چەند قاتى مانگەكانى ترە :-**

سەلمانى فارسى ئەگێڕێتەوە ئەفـەرموێ : پێغەمبـەرى خـوا ﷺ لـە ڕۆژى كۆتـایى شەعبان وتارى بـۆ دایـن فـەرمووى : { خەڵكینـە وا مـانگێكى گـەورە و پـیرۆز لێتان نزیك بوەوە و بەپیرتانەوە هات ، وەك سێبەرێك سێبەرتان لێ ئـەكات ... هـەر كەسێك بە ڕەوشتێكى چاك خۆى لە خودا نزیك بخاتەوە ، وەكو ئەو كەسە وایـە كـە كارێكى فەرزى لە مانگەكانى تر ئـەنجام دابێ .

هەر كەسێكیش كردەوە و ڕەفتارێكى فەرز و پێویـست كـراو لـەو مانگـە دا ئـەنجام بدات ، وەكو ئەوە وایە كە حەفتا فـەرزى لە مانگەكانى تردا ئەنجام دابێ ...} .

**دەیەم/ مانگى ڕەمەزان گەورە و سەیدى هەموو مانگەكانە :-**

پێغەمبـەرى خـوا ﷺ ئەفـەرموێ : {سید الشهور شهر رمضان...} واتە : گەورەى مانگەكان مانگى ڕەمەزانە .

لە فەرموودەیەكى تر ئەفەرموێ : { بە سوێندى پێغەمبەرى خوا ، ئەو مانگـەى ئێوە وا بە پیرتانەوە هات ولێتان نزیك بوە وە ، هیچ مانگێـك ڕانـەبردووە بـە سـەر موسڵماناندا چـاكتر و پـیرۆز بۆیـان لـەو مانگە ، بـە سـوێندى پێغەمبـەرى خـوا هیچ مـانگێكیش بـە سـەر مونافقـەكان ڕانەبردووە خراپتر بۆیان لەو مانگە ... } رواه ابن خزیمە و أحمد و البیهقى .

هەروەها ئەى فەرموو ﷺ : {اتاكم شهر رمضان شهر خیرٍ و بركةٍ }. واتە : وا مانگى ڕەمەزانتان هات مانگى پڕ خێر و بەرەكەت . بەئێمەیەوە تایبـەتى ئـەكردو ئـەى فـەرموو : { ... و رمضان شهر امتي ...}. واتـە : ڕەمـەزان مـانگى ئومەتەكەمە .

بۆى ئەپاڕایەوە ﷺ ئەى فەرموو : { اللهم بلغنا رمضان } . واتـە : پێغەمبـەرى خوا بەر لـە ڕەمـەزان ئەپاڕایـەوە و ئـەى ووت : خودایە بمان گەینیـەوە ڕەمـەزان . ئەوەنـدەى پـێ هـەڵ ئـەگوت مایـەى سەرسوڕمان بێت !! ئەى فەرموو ﷺ :

**{ لو یعلم العباد ما في رمضان لتمنت امتي ان تكون السنة كلها رمضان }** . واتە : ئەگەر بەندەكان بـزانن ڕەمـەزان چى تێدایـە ، ئومەتەكـەم ئاواتـە خـواز دەبوون چوار وەختى سـاڵ هـەر ڕەمـەزان بوایە !! .

بـەڵكو وەك میـوانێكى ئـازیز بـەخێرى ئـەهێناو ئـەى فـەرموو ﷺ : { اتـاكم رمـضان سـید الـشهور فمرحبـاً بـە واهلاً } .

**یازدە/ مانگێكە بە شێوەیەكى گشتى ژیانى خەڵكى تێدا خۆش ئەبێ و دەروازەى خێـر و بێریـان لێ ئەكرێتەوە :-**

پێغەمبـەرى خـوا ﷺ ئەفـەرموێ : {... مانگى دڵنەوایى یەكترو ئاگـا لێ بـوونى یەكترە ، مانگى یەكسانى ، مانگێكە ڕزق و ڕۆزى ئیماندارى تێدا زیاد ئەبێ... } .

لە فەرموودەیەكى تردا فەرموویەتى ﷺ : { بەخـشین و بـژێ و ژیـان لـە مـانگى ڕەمەزان فرەوان بكـەن ، بەخـشینى تێـدا وەكو بەخشینە لە ڕێگاى خودا }. ئینجـا بەخشین لە ڕێگاى خـودا چ بـە مانـاى :

جیهاد بێت ، چ بە مانای : یەك بە حەوت سەد بێت ، بۆ چینی هەژار و نەدار سوودی خۆی هەر هەیە و قازانجێکی لەو ناوە هەر پێ ئەگات .

ئەکەن ، جیاوازێیکی پێ ئەکەن زیاتر لە مانگەکانی تر .

خوێنەرانی بەڕێز و میوانانی ئەومانگە پیرۆزە ، مانگی ڕەمەزان دەیان بەرزی و ناخۆشی و گێروگرفتی دونیا و قیامەتمان ، خودایە مانگی ڕەمەزان لە ئێمە و لە موسڵمانان پیرۆز بکەی .

## باب الريان

قال رسول الله صلى الله عليه وسلم :

**إنَّ فِي الْجَنَّةِ بَابًا يُقَالُ لَهُ الرَّيَّانُ ، يَدْخُلُ مِنْهُ الصَّائِمُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ ، لَا يَدْخُلُ مِنْهُ أَحَدٌ غَيْرُهُمْ يُقَالُ أَيْنَ الصَّائِمُونَ فَيَقُومُونَ ، لَا يَدْخُلُ مِنْهُ أَحَدٌ غَيْرُهُمْ ، فَإِذَا دَخَلُوا أُغْلِقَ ، فَلَمْ يَدْخُلْ مِنْهُ أَحَدٌ**

متفق عليه

AlBetaqa.com

خوو ڕەوشتێکی بەرز و پیرۆزی پێغەمبەریش ﷺ بەتایبەتی لەو مانگەدا دەست کراوەیی و بەخشین بوە : { لە هەر هەموو کەس دەست کراوە تر بوە ، بە تایبەتی لە ڕەمەزان لە شنەی شەماڵ بە سوود تر و گشتی تر بووە } بخاری و مسلم .

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەچوە نێو ڕەمەزان ئەسیرەکانی ئازاد ئەکردن و ، هەر کەسێکیش داوای شتێکی لێ بکردبایە ئەی دایەو بێ بەشی نە ئەکرد .

لە چەندین فەرمودەی ڕابردووش پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی : {مانگی خێر و بەرەکەتە } {دەرگاکانی ڕەحمەتی تێدا ئەکرێنەوە }. جگە لەمەش : ئەریتی موسڵمانانیش بە گشتی لە ڕەمەزانا زیاتر دەستی یارمەتی بۆ چینی هەژار درێژ ئەکەن و، هەروەها بژێوی ژیانی خێزان و منداڵەکانیشیان فرەوانتر گەورەیی و پیرۆزیتری هەیە ، ئەمەی گوترا مشتێك بوو لە خەرمانێك ، لێرەدا بۆ زیاتر شانازی و دڵخۆشی ئێوە بە ڕۆژوو گرتنەکەتان و ، هەروەها سەربەرزی و سەرفرازیتان بە مانگی ڕەمەزان ، پێم خۆش بوو بە کورتی کەمێك باسی جەنابیشتان بکەم ئێوەی ڕێزداری ڕۆژووەوانی مانگی زێڕین ،

تۆی ڕۆژوو گریش ڕێز و بەرزیت کەمتر نی یە لە ڕۆژوو هەروەها لە مانگی ڕەمەزان ، إن شاءالله پێکەوە ئەچینەوە خزمەت پێغەمبەر ﷺ لە ئەلقەی داهاتوو .

یا ڕەبی خودا یە بە ڕەمەزانێ شەرمەزارمان نەکەی ، خودایە بە مانگی تۆ و ئوممەتی محمد ﷺ بە ڕێز و سەربەرزمان بکە ، شادمان بکە بە دەرگای ڕۆژوە وانەکان ، خودایە بێ بەشمان مەکە لە بۆنی میسکەکەی ، خودایە مانگی ڕەمەزان قەڵغان بێ لەگشت

## فەرموودە

**سَأَلَ رَجُلٌ رَسُولَ الله ( صلى الله علية وسلم ): أَيُّ الإسلام خَيرٌ؟ قَالَ: تُطْعِمُ الطَّعَامَ وتَقْرأُ السَّلَامَ عَلَى مَنْ عَرَفْتَ وَمَنْ لَم تَعرِف**

-متفق عليه-

## واتەی فەرموودە

**پیاوێك لە پێغەمبەری خوای ( صلى الله عليه سلم ) پرسی: چ کردەوەیەکی موسڵمان چاکترە؟ فەرمووی خۆراك ببەخشیت و سڵاو بکەیت لەوەی کە دەناسیت و کە ناشیناسیت.**




١-گەورەی ئەم دە شەوە لە قورئان و فەرموودەی دروستی پێغەمبەر(ﷺ) خوای گەورە ئەفەرموێ :﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ﴾ القدر واتە ئێمە ئەو قورئانەمان دابەزاندوە و ناردۆتە خوارەوە لە شەوێکی بەڕێز کە زۆربەی زانایان ئەڵێن ئەو شەوە لە دە شەوەکانی کۆتایی ڕەمەزانەوە لە ناو ئەو دە شەوەش شەوەکانی تاك واتە ٢١ ، ٢٣ ، ٢٥ ، ٢٧ ، ٢٩. لە سورەتی الدخان خوای گەورە ئەفەرمووێ: ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةٖ مُّبَٰرَكَةٍۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ﴾ الدخان ٣ واتە ئێمە ئەو قورئانەمان ناردۆتە خوارەوە لە شەوێکی پیرۆزدا کە شەوی قەدرە نەك ١٥ی شەعبان کەوا هەندێك ئەو ڕەئی یان هەیە، کەواتە ئەم دە شەوەی کۆتایی مانگی ڕەمەزان قورئانی تێدا هاتۆتە خوارەوە لە سورەتی البقرة ئەفەرمووێ ﴿شهر ال﴾ واتە مانگی ڕەمەزان ئەو مانگەیە کەوا قورئانی تێدا هاتۆتە خوارەوە لە سورەتی الفجر خوای گەورە ئەفەرمووێ:- ﴿وَٱلۡفَجۡرِ ١ وَلَيَالٍ عَشۡرٖ ٢﴾ الفجر ١-٢

واتە سوێند بە بەیانی کاتی بانگ وە سوێند بە دە شەوەی کە هەندێك لە مفسرین ئەڵێن مەبست لە دە شەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزانە وە ڕای هەڵبژاردەی مانگی "ذی الحجة"یە کە مانگی قوربانە بە هەر حال گەورەی ئەم دە شەوە لە قورئاندا هاتوە کە دەفەرمووێ ئەو شەوە خێری لە هەزار مانگ زیاترە کە دەکاتە ٨٣ ساڵ و چوار مانگ.

٢-أسباب النزول یان سبب النزول.

ئەوە بوو کە پێغەمبەرمان(ﷺ)باسی پیاوێکی کرد لە بنی اسرائیل کە وا شەو هەر نوێژی دەکرد بە ڕۆژیش غەزای دەکرد تاکو ئێوارە ئەو پیاوە هەزار مانگ بەردەوام بوو یارەکانی پێغەمبەر(ﷺ) کە ئەمەیان بیست گوتیان جا خۆ ئێمە تەمەنمان ئەوەندە درێژ نی یە تاکو بەو جۆرە خوا پەرستی بکەین ئەم سورەتە دابەزی کەوا هەر کەسێك ئەم شەوە زیندوو بکاتەوە بە خوا پەرستی خێری ئەم پیاوەی پێ دەگات جا بۆ ناوی قدری لێ نراوە؟ چەند ڕایەك هەیە:

یەکەم:- دەڵێن لە بەر ئەوەی خوای گەورە ڕێزی لێ ناوە لەم شەوە قورئان دابەزیوە.

دووەم:-دەڵێن لە بەر ئەوەی لەم شەوەدا تاکو ساڵێك هەموو شتەکان دابەش دەکرێ ئەدرێ بە چوار فریشتە وەك اسرافیل و میکائیل و عزرائیل و جبرائیل ئەوانەی لەو شەوە دیاری دەکرێ ڕزق و ڕۆزی باران بارین

سێیەم:- دەڵێن لەم شەوە ملائیکەتی بە قەدر و بە ڕێز دێنە خوارەوە کە لە شەوەکانی تر نایەنە خوارەوە .

چوارەم:- دەڵێن لەم شەوە خوای گەورە ئەندازەی بەزەیی خۆی بۆ هەر ئیمان دارێك تا ساڵی تر دیاری دەکات شتی زۆر گوتراوە ئەم باسە زۆر هەڵدەگرێ بەلام ئەوەندە نمونەیەك بوو لە فەرموودە گەورەی ئەم شەوە پێغەمبەرمان(ﷺ) ئەفەرمووێ ((من قام لیلة القدر إیماناَو إحتساباً غفر لة ما تقدم من ذنبه)) متفق علیه، واتە هەر کەسێك شەوی قەدر خوا پەرستی یکات باوەڕەوە داوای پاداشت و لە خوا بکات

خواى گەورە لە گوناهى پێش ترى خۆش ئەبێت.

عبدالله كوڕى ئیمام عمر(خواى گەورە لێیان ڕازى بێت) ئەفەرمووى پیاوانێك لە یارەكانى پێغەمبەر (ﷺ)لە خەودا بینى كەوا لیلة القدر هەفتەكانى ئاخیرى مانگى ڕەمەزانە مەبەست تاكەكانى كۆتایى ڕەمەزان بۆ پێغەمبەریان(ﷺ) گێڕایەوە فەرمووى وا ئەزانم خەونەكەتان موافقە لەو حەفت شەوەدا هەر كەسێك لێ ئەگەڕى بیدۆزێتەوە با لەو حەفت شەوە بۆى بگەڕێ ئەو فەرموودەیەش ئەوەیە كە ئەفەرموێ: (())متفق علیە.

وە دایكى ئیمانداران عائیشە( ڕەزاى خواى لە سەر بێت) ئەفەرموێ: ((كان رسول الله(ﷺ) یجاوز في العشر الأواخر من رمضان و یقول تحروا لیلة القدر في العشر الأواخر من رمضان))، واتە پێغەمبەرى خوا(ﷺ) لە دە شەوى كۆتایى زیاتر خوا پەرستى دەكرد وە دەیفەرموو بگەڕێن بۆ ئەم شەوە لە حەفتى كۆتایى. وە هەر لە حەزرەتى عائیشەوە(ڕەزاى خواى لێبێت) دەفەرمووێ: ((تحروا لیلة القدر من الوتر من العشر الأواخر من رمضان)) رواه البخاري. واتە بگەڕێن لەو شەوە لە تاكەكانى دەى كۆتایى ،وە هەر لە دایكى خۆشەویستمان ئەگێڕێتەوە ئەفەرمووێ: ((كان رسول الله إذا دخلت العشر شد مئزره و أحیا لیله و أیقظ أهله))متفق علیە.

واتە پێغەمبەرمان(ﷺ) كاتێك دەگەیشتە دەى كۆتایى ڕەمەزان هەموو شەوانى بە گشتى زیندوو ئەكردەوە وە خێزانەكانى بە خەبەر دێنا وە خۆى ماندوو ئەكرد، زانایان ئەفەرموون دوو مانای هەیە: یەكەم:- نە دەنوست .دووەم: خۆى لە خێزانەكانى دوور ئەگرت واتە لە گەڵیان كۆ نەدەبۆوە، تەنها خەریكى خوا پەرستى دەبوو، هەر لە دایكمانەوە ئەفەرمووێ: ((كان رسول الله یجتهد في العشر ما لا یجتهد في غیرها)). واتە پێغەمبەر(ﷺ) شەو و نوێژ و خۆ ماندوو كردنى لە ڕەمەزان زیاتر بوو لە كاتەكانى ترەوە لە دەى كۆتایى زیاتر بوو لە ئەوەڵى ڕەمەزان.

وە هەر لە دایكمانەوە ئەفەرمووێ: ((قلت یا رسول الله أرایت إن علمت اى لیلة لیلة القدر ما أقول فیها قال قولي اللهم إنك عفو تحب العفو فاعف عني)) رواه الترمذي. واتە گەر من زانیم شەوى لیلة القدرة چى بڵێم باشە فەرمووى بڵێ ئەى خوایە ئەتوو لێ بووردنت پێ خۆشە یەكێك لە ناوەكانتە خوایە بم بورە و وە لێم خۆش بە.ئەوەى كەوا پێویستە بكرێ لەم شەوانەدا ئەمانەن : نوێژ كردن، دوعا كردن، قورئان خوێندن زكر و یادى خوا و سەڵاوات لێ دان لە سەر پێغەمبەر(ﷺ) دوعا كردن بۆ موسڵمانان داوا كردنى گەیشتنەوە بە ڕەمەزانى تر، "السلف الصالح"

ئەوان بەم جۆرە ئەم شەوەیان زیندوو ئەكردەوە بە نوێژ و دوعا كردن و خێر كردنى صەدقە و قورئان خوێندن و تۆبە كردن گریان و پاڕانەوە تاكو بەیانى لەم دە شەوە دا نەدەخەوتن.

لە ئەسەرێك هاتووە حەزرەتى موسا (سەلامى خواى لە سەر بێت) فەرموویەتى یا ڕەبى شەوێك هەیە لەو شەوە خوا پەرستى خێرى هەزار مانگى هەیە بیدە بە ئۆمەتەكەم خواى گەورە پێ فەرموو ئەى موسا ئەو شەوە دراوە بە محمد(ﷺ)و ئومەتەكەى.

جا خوشك و برا موسڵمانەكان چەندەها شەومان كردوە بە نوستن و ڕابواردن و بێ ئاگاى چەندەها شەومان پاسەوانى كرد لە ماڵ و منداڵ و سامانى دونیا زۆر كەس شەوى كردۆتەوە تاكو بەیانى بە بێ هۆش و بە سەر خۆشى و چەندەها كەس شەوى وا هەیە پاسەوانى گرتوە لە كەسێك كەوا ستەم كارو داوێن پیس و دز بوە .

جا بۆیە داوا كارین لەم شەوە موسڵمانان خۆیان ئامادە بكەن وە بێ بەش نەبن لەم خێرە وەك فەرموودەكە ئەفەرمووێ: ((من حرم منها حرم الخیر كلە)) و لە كۆتایدا داواكارین خواى گەورە خێر و بەركەتى ئەو شەوەمان بە نسیب بكات .

# رۆژمێری مانگی ڕەمەزانی پیرۆز

ئا/ شوان رابەر

بێگومان بەدرێژایی دیرۆك مانگی رەمەزانی پیرۆز چەندان روداووهەلكەوتی گەورەو گرنگ و بزورگی هە مەجۆری تیادا روداوە كەلە ئامار نایەن ، نەخاسمە لەسەردەمی ئیسلامی ئازیزو روداوی ئیسلامی تائێستاكونێ ، ئێمە لێرەدا زۆر بەكورتی و گوشراوی وەكو بەركول و مشتێك هەندێ روداوی گەورەو دیارتان بۆدە خەینە رووكە لەم مانگە دا رویان داون .

*١ی رەمەزان:

- خوای گەورە "صحف"ی بۆ حەزرەتی ئیبراهیم ناردە خوارەوە سەلامی خوای لە سەر بێت.

- ساڵی (٢)ی كۆچی جەنگی ئوحد لە شاری مەدینە لە نێوان سوپای موسڵمانان و كافران لە كێوی ئوحد رویدا.

- ساڵی ٥٩٦ی زایینی قورئانی پیرۆز دابەزی تالە گوێ زەوی بكرێتە تاكە دەستور و بەرنامەی ژیانی ئادەمیزادو بونەوەرو، محمدی كوری عبدالله لەلایەن خوای گەورە كرا بە تاكە پێشەواو پێغەمبەروسەرداری بونەوەر.

* ٢ ی رەمەزان:

- ساڵی ١٣٣٨ك - ١٩٢٠/٥/١٩ یوسف وە هبە لە سەرۆكایەتی میصر دەستی لە كار كێشایەوە، جێ ی باسە ناوبراو كەسێكی "قبگی" بوو لە ساڵی ١٢٦٩ك لە میصر لە دایك بوو، لە ١٣٥٣ك مرد.

- ساڵی ٧٠٢ك - ١٣٠٣/٤/٢٠ز شەڕی (مرج الصفر) لە نێوان سوپای موسڵمانان و هۆلاكۆ ڕویدا.

* ٤ ی رەمەزان:

- ساڵی ١٥٢١ی زایینی شاری بەلگرادی پایتەختی مەجەر لە لایەن سوڵتان سولێمان قانونی یەوە فەتح كرا.

٥ ی رەمەزان:

- ساڵی ١٢٦٨ی زایینی دوای ١٧٠ ساڵ شاری ئەنتالیە بە سەركردایەتی (بیرس) لە ژێر دەستی خاچ پەرستەكان ڕزگار كرا.

- ساڵی ١٦٢٤ی زایینی تیمێكی سەربازی سەهیۆنیزم بە سەركردایەتی (موشیە دایان) ی جوولەكە لە شاری ( لد ) ٤٢٦ كەسی فەلستینی كوشتار گشت كردن.

٦ ی رەمەزان:

- تەورات لە لایەن خوای گەورە بۆ حەزرەتی موسای كوری مەتێ دابەزی، سەلامی خوای لە سەر بێت.

- ساڵی ١٣٧٨ك ١٩٥٩/٣/١٥ هەرێمی باكوری نێیجریا سەربەخۆی خۆی لە حكومەتی ناوەندی نێجیریا وەرگرت.

٧ ی ڕەمەزان:

- ساڵی ٩٧١ ی زایینی مزگەوتی (الازهر) لە سەردەمی دەولەتی فاتیمیەكان لە قاهیرەی میصر لە لایەن (جوهر الصقلی) كرایەوە.

- ساڵی ١٣٧٣ك - ١٩٥٤/٥/٩ز لیبیا و ئەمریكا ڕێككەوتنك یان واژو كرد بۆ مانەوەی هێزەكانی ئەمریكا لە بنكەی (الملاحه) لە لیبیا.

* ٨ ی ڕەمەزان:

- ساڵی٩ی كۆچی غەزای تەبوك لە نێوان موسڵمانان و كافرەكان ڕویدا.

- ساڵی ٧٠ی زایینی ئیمامی جەعفەر صادقی موجتە هید لە دایك بوو.

- ساڵی ١٣٥١ك - ١٣٥٢ / ١٩٣٣/١/٤ - ١٩٣٣ /٩/٢٧ اسماعیل صدقی بوو بە پاشایی میصر.

* ٩ ی ڕەمەزان:

- ساڵی ٢١٢ی كۆچی شاری صقلیە لە لایەن موسڵمانان رزگاری كرا.

- ساڵی ١٣٩٤ ك - ١٩٧٤/٩/٢٥ عبدالعزیز الحجازی لە میصر حكومەتێكی لە ٣٣ وەزیر پێك هێنا و، بوو بە سەرۆك وەزیران.

- ساڵی ١٣٨٥ك - ١٩٦٥/١١/٣١ز جان بیدال بوكاسای سەرۆك ئەركانی گشتی سەربازی لە كۆماری ئەفریقیای ناوەڕاست كودەتای بە سەر دافید داكوداكردو حكومەتێكی دامەزراند.

١٠ ی ڕەمەزان:

- ساڵی ١٣٩٣ ك - ١٩٧٣/١٠/٦ز سوپای مصر هێڵی (بارلیفی)ی بری

و چووه نۆکەندی سویس لە دژی جوولەکە.

- سالّی ١٣٦٥ك - ١٩٤٦/٨/٧ ڕه جەب بکر لە تورکیا حکومەتێکی لە ١٩ وەزیر پێك هێنا دوای حکومەتی شوکری سراج ئۆغلۆ.

* ١١ ی ڕەمەزان:

- سالّی ٩٥ی کۆچی سەعیدی کوڕی جوبەیر شەهید کرا.

* ١٣ ی ڕەمەزان:

- خوای گەوره ئینجیلی بۆ حەزرەتی عیسای کوڕی مەریەم ناردۆتە خوارەوه .

- سالّی ٧٩٥کۆچی جمال الدین ابو الفرج ناسراو بە (ابن الجوزی) کۆچی دوای کرد کە خاوەنی ٣٠٠ دانراوه.

- سالّی ١٣٤٦ك - ١٩٢٨/٣/٤ عبدالخالق سەرۆك پاشای میصر لە سەرۆك حکومەتی دەستی لە کار کێشایەوه.

* ١٥ ی ڕەمەزان:

- سالّی ٣ کۆچی ئیمامی حسینی کوڕی ئیمامی عەلی لە دایك بوو.

- سالّی ٢٧ی کۆچی محمدی کوڕی ئیمامی ئەبوبەکری صدیق بوو بە والی میصر.

- سالّی ١٥ی کۆچی فاتیمەی کچی پێغەمبەر ( صلی الله علیە و سلم ) وەفاتی کرد.

- شەوی هەینی ١٧ ی ڕەمەزانی سالّی ٤٠ی کۆچی ئیمامی عەلی لە ڕێگەی مزگەوت لە لایەن عبدالرحمنی کوڕی مەلجەمی خەواریج زامدار کراو لە ٢٠ی ڕەمەزانی هە مان سالدا مرد.

- دەولەتی خەلافەتی عوسمانی لە جەنگی تاتار بە سەر ڕوسیاری قەیسەر دا سەرکەوت.

- سالّی ٦٥٨ کۆچی شەری عین جالوت بەسەرکردایەتی لەدژی داگیرکەران بەسەرکردایەتی سولتان قۆتز ڕویدا.

- سالّی ١٩٥٤ی ز عەدنان مندریس لە تورکیا حکومەتێکی پێك هێنا.

* ١٦ ی ڕەمەزان:

- سالّی ١٦٥١ی ز خەدیجە تارخان کە بە نەژاد ئافرەتێکی نۆکرانی بوو لە دەولەتی عوسمانی کرا بە یاریدە دەری سولّتانی دەولەت.

- سالّی ١٣٨٠ ك - ١٩٦١/٣/٣ز مەلیك حەسەنی دووەم لە مەغریبی دوای باوکی بوو بە پاشای وولات.

* ١٧ ی ڕەمەزان:

- سالّی ٢ی کۆچی بۆ یەکەم جار جەنگی بەدری گەوره لە نێوان سوپای هاوەلان و موشریکانی مەککەدا ڕویدا کە تیاییدا ٧٠ کەس لە موشریکەکان کوژران و ٧٠ کەس یشیان لێ بەدیل گیران.

- سالّی ٥٨ی کۆچی خاتو عائیشە ی خێزانی پێغەمبەر( صلی الله علیه و سلم) لە تەمەنی ٧٠ سالّی لە شەوی سێ شەممە وەفاتی کرد . ٤٧ سالّ دوای پێغەمبەر ژیاو لە گۆرستانی بەقیع لە شاری مەدینە نێژرا.

- سالّی ٦٢٣ز خەلیفە موعتەسەمی کوڕی هارون رشیدی خەلافەتی عەبباس لە جەنگی عاموریە بە سەر دەولّەتی بێزە نتینی دا سەرکەوت، نزیکەی ٣٠٠٠٠ کەسی لێ کوشتن و دەیان هەزاریشی لێ ئەسیرو زامدار کردن .

- سالّی ٥٨ی کۆچی عەمری کوڕی عاصی هاوەلّی پێغەمبەر ( صل الله علیه وسلم ) کۆچی دوای کرد.

- سالّی ١٣٩٠ك مەحمود فەوزی سەرۆکی میصر لە حکومەتەکەی ئیستقالەی دا کە لە ١٩٧٠/١٠/٢٠ - ١٩٧٠/١١/١٦ لە سەر کار بوو

* ١٨ ی ڕەمەزان:

- سالّی ٦٤٢ی زاینی خالیدی کوڕی ولیدی گەوره هاوەلّ و فەرماندە کۆچی دوای کرد.

- سالّی ٣٥٧ك - ١٩٣٨/١١/١٠ز مستەفا کەمال ئەتاتۆرکی مەگۆلّی ڕێبەری عەلمانیەتی تورکیای نوێ مرد.

* ١٩ ی ڕەمەزان :

- سالّی ٥٧٠ك (صلاح الدین الایوبی) لە نزیك شاری حەمای سوریا بە سەر خاچپەرستەکاندا سەرکەوت ، بۆ سالّی ٥٨٤ ك زۆربەی ناوچەکانی ڕزگار کرد.

- سالّی ١٣٥٧ك - ١٩٣٨ /١١/١١ محمود جەلال بایار ڕۆژێك دوای مردنی کمال ئەتاتۆرك حکومەتێکی لە تورکیا پێك هێناو، بوو بە سەرەك وەزیرانی ولات.

- سالّی ١٤٠٩ك - ١٩٨٩/٤/٢٤ز خەلّکی شاری نواکشۆت و انوازیبو لە مۆریتانیا هەلیان کوتایە سەر جالیەی سەنگال.

* ٢٠ ی ڕەمەزان :

- سالّی ١٣٩٣ك - ١٩٧٣/١٠/١٦ز تیمێکی زرێپۆشی سەهیۆنی لە ناوچەی دفرسوار درز یان دە

سوپای مصر کرد و قەناتی سوێس یان بڕی.
*٢١ی ڕەمەزان :
- ساڵی ٨ کۆچی شاری مەککەی پیرۆز لە لایەن سوپای پێغەمبەر صلی الله علیه و سلم فەتح کرا.
*٢٢ ی ڕەمەزان:
- ساڵی ٢٧٣ك ئیبن ماجەی زانای فەرموودە ناس کۆچی دوای کرد.
*٢٥ ی ڕەمەزان:
- ساڵی ٤٧٩ کۆچی جەنگی زولاقە لە نزیك ئەندەلوس بەسەرکردایەتی تاریقی کوڕی زیاد ڕویدا.
*٢٦ ی ڕەمەزان:
- ساڵی ١٣٤٦ك - ١٩٢٨/٣/١٧ز محمد محمود لە میصر حکومەتێکی پێك هێنا.
٢٧ ی ڕەمەزان:
- ساڵی ١٩٨٣ز یەکەم بانکی ئیسلامی لە قەتەر دامەزرا بە بڕی ٢٠٠ ملیون ڕیاڵ.
- ساڵی ٥٨٣ك - ١١٨٧ز صلاح الدین الایوبی قودسی پیرۆزی لە ژێر دەست و ڕکێفی خاچپەرستە داگیرکەرە کان ڕزگار کرد.
*٢٨ ی ڕەمەزان :
- ساڵی ٩٢ کۆچی داستانی دۆڵی لکە لە ئیسپانیا ڕویدا بە سەرۆکایەتی تاریقی کوڕی زیاد کە دەرەنجام ئەویٚ ڕزگار کرا.
*٣٠ی ڕەمەزان :
- ساڵی ٢٥٦ کۆچی ئیمامی بوخاری فەرمودە ناسی خاوەنی کتێبی (صحیح البخاری) مرد.
- ساڵی .... ئیبن حەزمی خاوەنی کتێبی المحلی لە دایك بوو.

# میوانداری

محمد حمد خەتیٚ

بۆ سەردانی و چونە مالان    لە یاد نەکەی لە دەرگادان
بەر دەرگا ماڵ وەك سنورە    بە بێ مۆڵەت رامەبورە

با کاتت کاتی سەردان بێ    نەك کاتی نوستن و نان بێ
سلاو کردن لە خاون ماڵ    فەرمایشتە لە سەرمان

ئەگەر ووتیان ڕوخسەت نیە    شتیٚ هەیە بزانە چی یە
یا نەخۆشن یا ماندوونە    یا هیلاکن پاڵ کوتوونە

یا جیٚ ورێیان لا زەحمەتە    یا هەر شتیٚ لەم بابەتە
ئەبیٚ لامان ئاسایی بێ    نەچینە ژوور هەر چۆنی بێ

گەر ڕێیاندا بچیتە ژوور    برۆ ژوریٚ نور علی نور
پارستنی چاو و زمانت    چاك سازیە بۆ هەردوو ژیانت

مینوانداری بەم شێوەیە    دیارە کە خێری پێوەیە
پاسایەکی زەحمەت نیە    بۆ هەردوو لا سەر بەرزیە
با هەوڵدەین پەیڕەویکەین    وەکو دەستور کاری پێ بکەین

# چەند وانەیەك لە جەنگی بەدر

م.خیرالله ملاحسن

یەکێك لە تایبەتمەندەکانی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز، دەست پێ کردنی جەنگ و جیهاد تێیدا، لە پێناوی بەرز کردنەوەی ئیسلام و بڵاوبونەوەی ئەم ئیسلامە وەکو دوا پەیامی پەروەردیگار و کۆتا نیگای ئاسمانی بۆ سەر زەوی.

جەنگی بەدر یەکێکە لەو قوتابخانە نمونەیانەی خوای گەورە بۆ یەکەم جیلی ئەم ئیسلامەی کردەوە و ڕاستەوخۆ چاودێری کرد بە دابەزاندنی پەیتا پەیتای نیگای ئاسمانی لە لایەك و لە لایەکی تریش سپاردنی ئەو قوتابخانە نمونەیە بە بەڕێوەبەرێکی لێهاتوو کارامە و دڵسۆز کە ئەویش یەکەم مامۆستا و چاوساغی ئەم ئیسلامە – محمد المصطفی یە (ﷺ).

**هۆکانی پەیدابونی جەنگی بەدر**

زانایانی مێژوو و ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) یەك دەنگن لە سەر ئەوەی کە هۆکاری سەر هەڵدانی جەنگی بەدر ئەوەیە کاتێك پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ هاوەڵانیدا کۆچی کرد لە مەککە وە بۆ مەدینە، هەواڵ گەیشتە پێغەمبەر(ﷺ) کەوا ئەبوسفیان (ئەوکاتە بڕوای نەهێنا بوو موسڵمان نەبوو) سەر قافڵەی کاروانێکی گەورەی قورەیشەکان دەکات لە شامەوە بە ڕێکەوتووە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی دایە موسڵمانان بە موهاجیرو ئەنصاریەکان کە بچن ڕێگا لەو کاروانە بگرن و دەستی بە سەردا بگرن، بۆ ئەوەی ببێتە قەربوو کردنەوەیەك بۆ هاوەڵانی کۆچکردوو، کە قورەیشە بێ باوەڕەکان دەستیان گرتبوو بە سەر ماڵ و سامانی ئەو هاوەڵانەی لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) کۆچیان کرد لە مەککەوە بۆ مەدینە و ماڵ و خاکیان داگیر کرا لە لایەن بێ باوەڕەکان، کاتێك قورەیشیەکان بەمەیان زانی هەر هەموویان کۆبوونەوە بە بەشداری هەموو ناو دار و کەسایەتیە بە ناوبانگەکانی قورەیش بۆ شەڕکردن و بەرەنگاری سوپای کەم چەك و تفاقی پێغەمبەر(ﷺ) .

پێغەمبەر(ﷺ) بەڕێکەوت لە گەڵ یاوەرانیدا لە سەرتای مانگی ڕەمەزاندا بوو کە ژمارەیان (٣١٤) سێ سەدو چواردە کەس بوون، (٧٠)حەفتا ووشتریان لە گەڵدا بوو.

ئەبوسفیان هەواڵی ئامادەباشی سوپایی پێغەمبەری(ﷺ) زانی و کاروانەکەی لە ڕێگای سەرەکی لادا کە دەچێتەوە بۆ مەککە و بەڵکو بە دەشت و بیاباندا ڕۆیشت و خۆی ڕزگار کرد و کاروانەکەشی لە مەترسی قوتار کرد، لە پاشان پێغەمبەر(ﷺ) زانی قورەیشەکان بە مەبەستی شەڕکردن سوپایەکی زۆر لە ژمارە و چەك و تفاق و پێداویستی شەڕیان ساز کردووە نیازیان خراپە و دەیانەوێ بە سەر سوپای پێغەمبەر(ﷺ) دا بدەن، پێغەمبەریش(ﷺ) ڕاوێژی بە موسڵمانان کرد بۆ ئەوەی بڕیاری شەڕکردن یان شەڕ نەکردن بدەن، هاوەڵە بەڕێزەکانی پێغەمبەریش(ﷺ)ووتیان: ئەی نێردراوی خوا ئەگەر فەرمانمان پێ بەکەیت بچینە ناو بەحر ئێمە فەرمانەکەت جێ بەجێ دەکەین و ناگەڕێینەوە خوای گەورە چ فەرمانێکی پێ کردوویت پێمان بڵێ و بە سەر و ماڵ لە خزمەتداین.

لە پاشان پێغەمبەر (ﷺ) مژدەی پێدان کە خوای گەورە سەرمان دێخیت و قورەیشیەکانیش تێك دەشکێنێ.

جەنگی بەدر دەستی پێ کرد لە ڕۆژی جمعەی ساڵی دووەمی کۆچی لە ڕۆژی حەڤدەی مانگی ڕەمەزان لە سەرەنجام موسڵمانان سەرکەوتنیان بە دەست هێناو ئەم سوپاکەمەی پێغەمبەر(ﷺ) توانی

بە سەر ئەم سوپا زۆرەی قورەیشیەکان کە هەزار کەس بوون بە هەموو پێداویستیەکانی تەواو بۆ شەڕکردن لەووشتر و خواردەمەنی و تیرئەندازی بە ناوبانگی قورەیش سەر بکەون و ئەم سەروەریە گەورەیە تۆمار بکەن بۆ مێژووی ئوممەتی ئیسلام.

چەند پەند و وانەیە و ئامۆژگاریەك لە جەنگی بەدر:-

یەکەم :- مەبەستی جەنگی بەدر شەڕ کردن نەبوو لە سەرەتادا هەر وەکو لە پێشتر باسمان کرد، بەڵکو مەبەست دەست گرتن بوو بە سەر ئەو کاروانە گەورە بازرگانیەی قورەیش کە بە سەرۆکایەتی - ئەبوسفیان- لە شامەوە بەرەو شاری مەککە بەرێ کەوتبوو، ئەمەش لە پێناو ئەوەی تۆڵە کردنەوەیەك بێت لە بەرامبەر ئەو هەموو ستەم کاری و داگیر کاریەی قورەیش لە مەککە دەرحەق بە ماڵ و سامانی هاوەڵە کۆچکردوەکانی پێغەمبەر(ﷺ) ئەنجامیان دا، مەبەستی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوە بوو کەمێك دڵی هاوەڵەکانی بداتەوە و قەرەبووی مادییان بۆ بکات. بۆیەش لە سەر ئەم هەڵوێستەی پێغەمبەرە (ﷺ) زانایانی فیقهی ئیسلامی بە ڕەوایان داناوە کەوا ماڵی زەوتکراو (المال المغصوب) دروستە بۆ خاوەنەکەی بە هەر ڕێگایەك بێت لە کەسی زەوتکەر (الغاصب) وەری گرێتەوە و بسێتێنێتەوە. بەلام لە کۆتایی

شەڕەکە هەڵگیرساو خوای گەورە بە قازانجێکی زیاتر بۆ موسڵمانانی دانا و سەرەڕای ئەو هەموو ماڵ و سامانەی موسڵمانان بە (غەنیمە)تیان گرت و لە قوریشەکان، سەرکەوتنێکی گەورەشیان تۆمار کرد و توانیان حەفتاکەس لە گەورەکانی قورەیش بکوژن و حەفتا کەسیشیان لێ بەدیل بگرن . لە بەرامبەر دا مووسڵمانان چواردە کەسیان لێ شەهید بوون . ڕوحی پاك و خاوێنیان گەڕایەوە لای پەروەردگار و بەمەش سەربەرزی دونیا و ڕوو سوری قیامەتیان بۆ خۆیان مسۆگەر کرد و بوونە یەکەم کاروانی شەهیدانی ئیسلام و خوێنی گەشیان بوو بە هەوێنی بەر پاکردنی فیداکاری لە پێناو بەرزی و بڵندی بەیداخی پڕ لە هیوا و ئاواتی هەموو کەسێك کە بە جیاوازی ڕەنگ و زمان و خاك و ئەم دروشمە دەڵێتەوە ( لا إلە إلا اللە محمد رسول اللە ).

دووەم: پابەندبوونی پێغەمبەر(ﷺ) بە بنچینەی (الشوری) پرس و ڕاکردن.

ئەم خاڵەش زۆر بە جوانی دیارە و ئاشکرایە لە سەر تاپای ژیانی پێغەمبەر(ﷺ) کە هەر کاتێك ویستبایی کارێك ئەنجامدات پەیوەندی بە کار و باری ئیسلام وموسلمانانە هە بێت . تاکڕەوانە بیری نە دەکردەوەو بڕیاری خۆی نە دەسەپاند بەسەر کەسدا. بەڵکو

پرس و ڕای بە موسڵمانان و کەسانی خاوەن ژیری و پسپۆری دەکرد، ئەمە لە کاتێکدا هیچ دەقێك لە قورئانی پیرۆز نەبوایە، ئەوا دەرگای بڕیار و کۆتا قسەی دەخستە بەردەستی هاوەڵە بەڕێزەکانی وزۆر بە ووردی گوێبیستی سەرنج و تێبینیەکانی دەبوو، وە لە نێوان ئەو سەرنج و تێبینیانەدا کامەیان چاکتر و لە بارتر و بوایە لە پێناو بە دەستهێنانی قازانجی گەورە و لادانی زیان و شکست ئەویانی هەڵدەبژاردوو دەیکردە نەخشەی ڕێگا، وە پێویستە لە سەر شانی هەموو کار بە دەست و فەرمان ڕەوایەکی مووسڵمانان بەم شێوەیە بیربکاتەوە و مامەڵە لەگەڵ دەست پێوەندەکانیدا بکات ، خۆی دوور بگری لە دیکتاتۆری و خۆ فەڕز کردن و تاکڕەوی ،چونکە سەرنجامێکی شومیان هەیە هەم لە دوونیا و هەم لە دوا ڕۆژ ،بۆیە موسڵمانان یەکدەنگن لە سەر ئەوەی هەر کارو بارێك دەقێکی لە سەر نەبوو لە قورئان و سوونئەت وە ئەو کار و فرمانەش پەیوەندی بە بەڕێوەبردنی کاروباری موسڵمانان و سیاسەتی شەرعیەوە هەبوو ئەوە دەخرێتە بەرەو دەستی کەسانی پسپۆر و شارەزاو شەرع زان بۆ گفتوگۆ لە سەر کردن و پرس و ڕادەربڕین لە بارەیەوە کە پێ ی دەگوترێ (مبدء الشوری) بنەمای پرس و ڕاگۆڕینەوە وە ئەم

بنەمایە گرنگەش کە –شوری– یە، بنـچینەیەکەی پتـەو خـاوەن قورسـایی خۆیـەتی و پێویـستە فـەرامۆش نـەکرێت بـەو شـێوەی کەوا باسمان کردن نموونەی پرس و رای پێغەمبـەری شیش (ﷺ) بـە هـاوەڵان ئەوەندە زۆرە و لە ژمارە نایەت بەس لە شەڕی بەدر دا زیاد لە چەندین جار پرسی پێ کردن وەکو ئایا شەڕ بکەین دوای دەرباز بـوونی کـاروانی ئەبوسـفیان؟ دەربـارەی جێگـای دامـەزرانی موسڵمانان بـۆ شـەڕی ئوحد کـام جێگا باشە؟ یان دەربارەی دیلەکان ؟ بکوژرێن یان ئازاد برکێن؟

سێیەم: دروستە بـۆ گـەورە و کـار بەدەستی موسڵمانان هـە واڵنێر و چاودێر بە کار بهێنێ لە کاتی شـەڕ و جـەنگ و جیهـاددا کـە لێـرەدا گرنگـی ئـەم خاڵـەمان بـۆ دەردەکـەوێت لـە کاتێکـدا لـە سـەردەمی پێغەمبـەردا (ﷺ) هـیچ دەزگایەکی ڕاگەیاندن یان ئامرازی پەیوەنـدی کـردن وەکـو تەلـەفۆن و مۆبایـل و ئەنتـەرنێت نەبووە،ئـەم خاڵـە بەڵگـەی بـەهێزی لێزانـی وچـاپوکی پێغەمبـەرمان(ﷺ) بـۆ دەر دەکەوێت کەوا گەڕاوە بە دوای هـەموو هۆکارێـك بـۆ بەدەسـت کەوتنی زانیاری دەربارەی دووژمن لـە زۆر بـواردا بـۆ نمونـە ژمـارەی دوژمن ژمارەی ووشتر و سـەرکردە و تـیر هاوێـژەکانیان ،کـەلو پـەلی پێداویستی کە بۆ ئەو کات بە کار دەهات وەکو تیر و کـەوان و قـەڵغان و.... هتد.

کە ئەمانـە زانـران دەکرێـت ئامـادە باشی تـەواو بکرێـت بـۆ جەنگەکـەو هـــەموو ئەگـــەر و پێـــشهاتێك چارەسـەری بـۆ دابنرێـت، بەڵگـەش بۆ ئەو خاڵەی ئێستامان ئەوەیە کە زانایـانی ژیـانی پێغەمبـەر(ﷺ) باسـی دەکـەن کاتێـك پێغەمبـەر (ﷺ) قۆناغیـان دانـاو جێگایـان دیاری کرد لـە نزیـك (بدر) لە گـەڵ یەکێك لە هاوەڵـە کانیدا چوون بۆ لای پیاوێکی پیر و بە تەمەن کە لە سەر ڕێگایەك ڕاوەستا بوو، چەند پرسیارێکی لە پیاوە پیرەکە کرد، لەوانـە:– دەربـارەی قـورەیش و محمـــدی کـــوڕی عبـــدالله و هاوەڵەکانی ؟ کابرا پیرەکە گوتی : وەڵامت نادەمەوە تاکو نەزانم ئێوە کـێن؟ پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمووی ئەگـــەر وەڵامـــی پرســـیارەکانت دامـەوە پێـت دەڵـێین ئێمـە کـێین ، پیاوە بە تەمەنەکە وەڵامـی تـەواوی پرسـیارەکانی پێغەمبـەری (ﷺ) دایـەوە لـە پاشـان پرسـیاری لـە پێغەمبەر(ﷺ) کرد و ووتـی: ئێوە کێن؟ پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی ((نحـن مـن المـاء)) پیـاوە بـە تەمەنەکە وا تێ گەیشت کە خەڵکی عێراقن لە بەر ئاوی دجلە و فوڕات ، بـــەڵام پێغەمبـــەریش(ﷺ) مەبەستی ئەم ئایەتە بوو﴿ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴾ الأنبياء: ٣٠ واتـە: ئێمـە هـەموو شتێکی زیندوومان لە ئاو دروست کردووە، کە بێگومانیش مرۆڤیش یەکێکە لـەو دروسـت کراوانـەی کە خـوا دەفـەرمووێ لـە (نطفـة)مـان دروست کردووە.

چـوارەم : گرنگـی پاڕانـەوە و ملکەچی نواندن لە بەرامبەر خوای گەورە (جل جلاله) لە هەموو کاتێك کـە مـرۆڤ دەکەوێتـە قۆنـاغێکی سەخت و دژوار لە ژیانیدا.

بە شێوەیەك هـەموو دەرگاکـان بـە ڕووماندا دادەخرێن تە نها دەرگای ئاسمـان و بارەگـای پـەروەردگار نـەبێ، ئەمـەش لـە کاتێکدا زۆر بـە جـوانی ئـەم خاڵـە هەسـت پـێ دەکـەین لـە جـەنگی بـەدر کاتێـك پێغەمبـەر(ﷺ) لـە شـەوی جمعـە ١٧/١٦ ی ڕەمـەزان ساڵی دووەمـی کۆچـی بە درێـژایی ئـەو شـەوە لـە کەپرەکەی لە بەر خوا دەپاڕەیەوە و بـەو پـەڕی ملکەچـی نوانـدن بەرامبـەر گـەورەیی دەسـەڵاتی خوای گەورە تێکەڵ بە فرمێسك و ئارەقـە دەسـتە پیرۆزەکـانی بـەرەو ئاسمان پان کردەوە و ڕاز و نیازی لە گەڵ پەروەردگاری دەکرد ، تا بە ئەندازەیـەك پاڕایـەوە ئیمـامی ئـەبوبکری صـدیق(خـوا لێـی ڕازی بـێ) کـاتێ کـە بـەو شـێوەیەی خۆشەویستی(ﷺ) دیـت سـۆز و میهرەبانی بۆ جۆشاو عەرزی کرد: ئـەی خۆشەویـستی خـوا ... بەسـیەتی دوعـا کـرد... خـوای گـەورە بـەڵێنی خـۆی جـێ بـە جـێ دەکات سەرکەوتن دەبێتە بەشمان

،لــه پاشــان پێغەمبــەر(ﷺ) فــەرمووی: ئــەوە جێگــای فلانــە زلهێزی کافرە لێرە دەکوژرێ ئەوە جێگای ئەوە، ئەوە جێگای ئەوە ، لە پاشان دەرکەوت چ جێگایەکی دیاری کرد بۆ کوژراوانی هەر کافرێك لەو جێگایەدا کوژرا ئەمەش موعجیزەیەکی تری پێغەمبەرە(ﷺ) بوو کە جێگای کوژرانی بێ باوەڕانی دیاری کرد و هەر هەمووشیان لە شوێنەکانیان کوژران کە پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی پێ کردبوون.

ئەوەی کە باسمان کرد حاڵی خۆشەویسترین کەسی پەروەردیگارە لە سەر زەوی کە بەم شێوازە لە خوای گەورە پاڕاوەتەوە داکۆکی زۆری لە دوعا کردن کردووە، بۆیە یەکێك لە ئاداب و ڕەوشتی دوعا کردنیش (الحاح)ە واتە زۆر دوعا کردن سێ جار دووبارە کردنەوەی دوعایەکان خوای گەورە حەزی لە ڕاز و نیاز و کڕوزانەوەی بەندەکانیەتی کاتێك کە داوای لێ دەکەن، بۆیە سوننەتە مرۆڤی موسڵمان زۆر لە قاپی خوا بداو داوای لێ بکات وە بۆ ئەمەش پێغەمبەری خوا(ﷺ) بکاتە مامۆستا و پێشەنگ کە چۆن و بە چ شێوازێك داوای لە خوای گەورە کردووە و خوای گەورەش وەڵامی دوعاکاران دەداتەوە ﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا دَعَانِ فَلْيَسْتَجِيبُوا لِي وَلْيُؤْمِنُوا بِي لَعَلَّهُمْ يَرْشُدُونَ ﴾ البقرة: ١٨٦.

پێنجەم : هاتنە خوارەوەی فریشتەکانی خوا لە ئاسمانەوە بۆ شەر کردن لە گەڵ سوپایی ئیسلامدا لە دژی بێ باوەڕانی قوڕەیش، ئەم گۆڕانکاریە گەورەیە لە جەنگی بەدر خاڵێکی وەرچەرخان بوو (هاوسەنگی هێز گۆڕا) خوای پەروەردگار یارمەتی بەر چاوی پێشکەشی ئەو کۆمەڵە جەنگاوەرە بۆ خوا دڵسۆزەی کرد، چونکە پەروەردگار بەڵێنی داوە﴿ إِن تَنصُرُوا اللَّهَ يَنصُرْكُمْ ﴾ محمد: ٧ هەزار فریشتە بە سەرکردایەتی جبریل دابەزین لە ئاسمانەوە و زەبری گورچك بڕیان لە بەرەی کوفر وەشاند، ئەوەتا خوای پەروەردیگار لە قورئانی پیرۆز دا ئەم ڕاستیەی چەسپاندووە دەفەرموێ: ﴿ إِذْ تَسْتَغِيثُونَ رَبَّكُمْ فَاسْتَجَابَ لَكُمْ أَنِّي مُمِدُّكُم بِأَلْفٍ مِّنَ الْمَلَائِكَةِ مُرْدِفِينَ ﴾الأنفال:٩

،ئەم گۆڕانکاریە گەورەیە لە بەرەی جەنگیدا بە دابەزینی فریشتەی پەروەردیگار بۆ دوو خاڵی سەرەکی دەگەڕێتەوە ، یەکەمیان:- زۆر دوعا کردنی پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵە بەڕێزەکانی هەروەکو ئایەتەکە ئاماژەی بۆ کردووە. دووەمیان: دەروون پاکی و خوا مەبست بوون بە سەر خستنی پەیامەکەی و پشتوانی بۆ پەیامبەرەکەی تاکو ئەو ئەندازەی زۆرەی پشتوانی خوای گەورە لە جەنگی بەدردا جبریل بەشداری تێدا دەکات پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێ ((هذا جبريل آخذ بزمامفرسه عليه أداة حرب)) رواه البخاري ١٤/٥. واتە ئەمە جبریل هات جڵەوی ئەسپەکەی گرتوە و ئامرازی شەڕکردنیشی لە گەڵ ئەسپەکەی سوار کردووە.

زانایانی تەفسیری قورئانی پیرۆز دەفەرموون بۆیە خوای گەورە ووشەی (ألف) واتە هەزاری بۆ فریشتەکان بە کار هێناوە و ژمارەی دیاری کردووە بۆیان(تاکو ڕێگای هەموو ئەوانە بگرێ کەدەیانەوێ ئەم یارمەتیدانەی (خوا) تەنها لەلایەنی دەروونی کورت بکەنەوە) بەڵکو بە ڕۆژی ڕوون فریشتەی دابەزاند بۆ ئەوەی ببێتە مژدەی خۆشی و دڵنیایی و دەروونی هاوەڵەکانی پێغەمبەر (ﷺ) هەروەکو خوا دەفەرموێ ﴿ وَمَا جَعَلَهُ اللَّهُ إِلَّا بُشْرَىٰ لَكُمْ وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِ ۗ وَمَا النَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ اللَّهِ الْعَزِيزِ الْحَكِيمِ ﴾ آل عمران: ١٢٦ئەمەو چەندین دەرس و وانەی گرنگ کە لە جەنگی بدر دەستمان دەکەوێ و بەوەندە کۆتایی پێ دێنین هەر کەسێك حەزی زیاتری لە دەرس و عیبرەتی غەزوەی بدرە با بگەڕێتەوە بۆ کتێبی بە ناو بانگی: ( فقه السيرة النبوية) لە نوسینی (دکتور محمد سعيد رمضان البوطي ) (جزاه الله خيرا).

# ئايا جنۆكە دەچێتە لاشەی مرۆڤ

## تێڕوانینێکی شەرعیانە

م/ إسماعيل سوسەیی بەشی (٣)

الحمدلله،والصلاةوالسلام على رسول الله ،وعلى آله وصحبه ومن والاه أمابعد:

لە کۆتایی ئەڵقەی ڕابردوو وادەماندا، کە باسی "سحر" جادوو، "کهانە" نهێنزانی، "عرافە" فال گرتنەوە، "شعوذة" فێڵ و چاوبەستکی، کارە ناشەرعی و سەختەکاریەکانی ئەو بوارە بخەینە بەر چاو، لە گەڵ ناساندنی چارەسەر کاری متمانەی شەرعی.. جا ناساندنی چارەسەر کار لە بەر درێژ بوونەوە دەخەینە ئەڵقەی داهتوو گەر خوا حەز بکا..

لەو ئەلقەیەدا بە پشتوانی خودا بە پوختی ئەو چەند ناو نیشان و سەر باسانە وورد دەکەینەوە و تیشکیان دەخەینە سەر:

١-مێژووی جادوو "سحر"و گرنگی ئەو بابەتە بۆ سەردەمی ئیستا.

٢-پەیوەندی نێوان جادوو "سحر" و جنۆکە.

٣-پێناسەی چەند زاراوەیەك "سحر،کهانة، عرافة،شعوذة"

٤-ئایا جادوو "سحر" ڕاست و حەقیقەتە یان خەیاڵ وەهمە.

٥-جۆرەکانی جادوو و حوکمی فێربوونی.

٦-حوکمی چونە لای جادوگەر "ساحر" نهێنزان"کاهن" ، فالْ گرەوە"عراف"

٧-چارەسەری جادوو لە پێش و تووشبون و دوای توشبون.

٨-نیشانەکانی ناسینەوەی "ساحر" و "کاهن" و فالْ گرەوە.

٩-ئاگادار کردنەوە لە چەندین خاڵ و نوشتەی داهێنراوی بێ شەرعی.

**ووردکردنەوە درێژەی سەرە باسەکان:**

**١-مێژووی جادوو "سحر"و گرنگی ئەو بابەتە بۆ سەردەمی ئیستا:**

زۆر بە کوشراوی و پوختی مێژووی "سحر" و "کهانة" و فالْ گرتنەوە، دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی مرۆڤایەتی دوای باوکە ئادەم (عليه السلام) ئەوەش لە دیدگای قورئانی پیرۆزەوە کە دەقەکانی بەڵگەن لە سەر ئەوەی، پێغەمبەران (عليهم السلام) هەر یەکەیان لە لایەن ئوممەتەکانیانەوە تۆمەتی جادوو شێتەتیان پێ هەڵبەستراوە، جا ئەگەر ئوممەتەکان شارەزا نەبان لە جادوو "سحر" و نەیانزانیبوایە چیە، چۆن ئەوەیان هەڵدەبەست... خودا فەرموویەتی: ﴿كَذَٰلِكَ مَآ أَتَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا قَالُواْ سَاحِرٌ أَوْ مَجْنُونٌ﴾ الذاريات: ٥٢

واتا: هەر ئا بەو شێوەیە هیچ پێغەمبەرێك (عليهم السلام) لە پێش ئەمانەدا نەهاتووە، خوا نەناسان

پێیان نه ووتبێ جادوو گەر یان شێت.

نابێ وەكو ئەو لێكۆڵەر و مێژوو نوسانە بڵێین، كە مێژووی جادوو بۆ پێش ئایین و بیروباوەر دەگەڕێتەوە، چونكە لە دیدگای قورئان یەكەم مرۆڤ كە باوكە ئادەمە (عليه السلام) بڕواداری خاوەن خودا بەیەكگر "توحيد الله" بووە، لە دوای ئەو لاڕێی مرۆڤ دەستی پێكردوە، بە دڵنیایەوە چونكە جادووش یەكێكە لە لاڕییەكان لە دوای ئەو سەری هەڵداوە... بەردەوام لە هەموو چاخەكان تا ئێستا كەم یان زۆر بوونی بووە لەم سەردەمە كە مرڤایەتی لافی پێشكەوتن لە بواری زانست و تەكنەلۆژیا لێدەدا، وەكو دیاردەیەكی جیهانی دیارە و باوە و بن بڕنەبووە، بەڵكو هەزاران خەڵكی سادە و نەفام لە سەرتا سەری جیهان بگرە بە سەدان لە چینی ڕۆشنبیرو خاوەن بڕوانامەی زانستی و پلەداران و سیاسەتمەدار و سەرۆكو سەركردەكانی جیهان بە گشتی و هەندێك لە سەرۆكەكانی وولاتە زلهێزەكان بە تایبەتی گیرۆدەیی بوونەو بایەخی پێ دەدەن سامان و پارەیەكی زۆری لە پێناو بە فیرۆ دەدەن، بۆ نمونە لە وولاتێكی وەكو فەرنسا كە لە دیدی ڕۆژئاوا و پێڕەكانیان بە بێشكەو دەروازەی پێشكەوتن دانراوە و خاوەن شۆڕشی پیشەسازییە لە سەر ژمێرێكی چەند ساڵێك بەر لە ئێستا جادوكەر "ساحر" و "كاهن"ەكان ژمارەیان "٣٠٠٠٠" سی هەزار خەملێندرا...

بە داخەوە وڵاتانی بە ناو ئیسلامی و كۆمەڵگای مسوڵمانانیش لەو دیاردە و دەردە بێ بەش نیە بە ڕێژەی جیاواز لە ناویاندا باوە و هەیە.

كەواتە ئەو دیاردە خراپ و ئەو دەردە پیسە دیاردەیەكی جیهانی گشتییە كێشەیەكی لە مێژینەی سەردەمییە،وەكو پێویستیەكی شەرعی و زەرورەتێكی هەنووكەی لە دیدی ئێمە مسوڵمان غەم خواردن لە بابەتەكەوە ڕوونكردنەوەی و دیاریكردنی هۆكاری گرفت و چارەسەری و خەڵك لێی بە ئاگا هێنان و تێگەیاندنیان لە ڕاستیەكان و بە دیار خستنی و زیانەكانی گرینگەو جێگای بایەخ پێدانە و ئەركی سەرشانمانە..

هەندێك لە جۆرەكانی جادوو "كفر و شرك" هەندەكەی تریشی لە تاوانە مەزنەكانە بە دەیە هاوكێشە و گرفتیشی لێ دەكەوێتە و بۆ تاكو كۆمەڵ هەر لە پچڕانی پەیوەندی خێزانی و جیابونەوەی هاوسەرەكان و ڕق و دوژمنایەتی لە نێوان دۆست و خۆشەویستان و شێت بوون و دڵە ڕاوكێ و پارە بە فیرۆدان و سەر قاڵ بوون...هتد.

جا وەكو هەنگاوێكی "متواضع"انە بەم كەمە نوسینە بەشدار بووم لە چارەسەری و خستنە ڕووی ئەو دیاردە و باسكردنی... خودا لێمان وەربگرێ و بیكاتە مایەی كەم بوونەی ئەركی سەر شانمان و بە ئومێدی ئەوەی خوێنەرانیش سوودی لێ وەربگرن.

**٢-پەیوەندی نێوان "سحر" جادوو جنۆكە:**

لە باس و ڕوونكردنەوەی جۆرەكانی "سحر" لە خاڵی پێنجەمی باسەكەمان دەردەكەوێت كە جادوو و بە كۆمەكی شەیتان و جنۆكە شەیتانەكانیش دەكرێت، كەواتە جادوو و جنۆكە پەیوەندیەكی ڕاستەوخۆ و پتەو یان بە یەكەوە هەیە لە بەر ئەوەشە لە زۆربەی نوسراوەكانی باسی جنۆكە ڕاستەوخۆ باسی جادوو دەكرێت..

**٣-پێناسەی چەند زاراوەیەك "سحر،كهانة، عرّافة،شعوذة"**

**<u>١-جادوو لە زمان و زاراوەدا:</u>**

**السحر لغة و إصطلاحاً:**

*جادوو له زمانه‌وانیدا: "السحر لغة": جادوو "سحر" له زمانی عه‌ره‌بی به‌و واتانه هاتووه

-نیشاندانی ناهه‌ق "باطل" له وێنه‌ی هه‌ق و ڕه‌وا.

-كارو شته‌كانی كه هۆكاره‌كانیان بزر و شاراوه‌نن یان ناسك و باریكن.

-فێل یش چونكه هۆیه‌كه‌ی بزرو شاراوه‌یه.

*جادوو(سحر)له‌زاراوه‌دا:السحر اصطلاحاً:

جادوو له به‌ر زۆری جۆر و جیاوازی به‌ش وێنه‌كانی چه‌نده‌ها پێناسه‌ی جۆراو جۆری كراوه، شێخ( محمد الامین الشنقطي) له "أضواء البیان" دا فه‌رموویه‌تی: (بزانه جادوو له زاراوه‌دا ناتوانردێ پێناسه بكرێت به پێناسه‌یه‌كی كۆ كه‌ره‌وه‌ی قه‌ده‌غه كار "جامع و مانع" له به‌ر زۆری جۆره جیاوازه‌كانی كه ده‌كه‌وێته ژێریه‌وه واته: ژێر پێناسه‌و زاراوه‌كه) ئه‌ندازه‌ی هاوبه‌ش له نێوانیاندا نایه‌ته‌دی، تا كۆكه‌ره‌وه بێ بۆ پێناسه‌ی جادوو جۆره جیاوازیه‌كی له یه‌كتر جیای تێكه‌وتووه.

-ابن قدامة رحمه‌تی خوای لێ بێ: ده‌فه‌رموێ: جادوو: گرێ و نوشته‌یه‌كی به قسه یا به نوسین ده‌كرێ یان "جادووگه‌ر" كارێكی ده‌كا كه كاریگه‌ری له سه‌ر لاشه یان دڵ یان عه‌قڵی جادوو لێكراو "المسحور" ده‌كات، به بێ گه‌یشتن و و ڕووبه ڕووبوونه‌وه).

-كوڕی عائیشه "إبن عائشه" فه‌رموویه‌تی: عه‌ره‌به‌كان له به‌ر ئه‌وه‌ی ناوی جادوو "سحر" یان به "سحر" بردوه، چونكه: ته‌ندروستی لاده‌دات وه ده‌گۆڕێ بۆ نه‌خۆشی، "لسان العرب، سحر".

٢-نهێنزانی له زمان و زاراوه‌دا: "الكهانة لغة و اصطلاحاً"

*نهێنزانی له زمانه‌وانیدا: "الكهانة لغة": "كاهن" كه كه‌سه نهێنزانه‌كه‌یه به‌و واتایانه له زمانی عه‌ره‌بی دا هاتووه:

-كاهن: خاوه‌نی زانیاری وورد، پزیشك ، سه‌رپه‌رشتیار، مشورخۆر، بۆ پێداویستی كه‌سێكی پێویست، بانگه‌شه‌كار بۆ شاره‌زای له نادیار و نهێنیه‌كان "الغیبیات" "لسان العرب:كهن"

*نهێنزانی له زاراوه‌دا: "الكهانة اصطلاحاً":

شێخ "ابن حجر الهیتمی" له "الزواجر:١٠٩/٢" دا ده‌فه‌رموێ: ("كاهن" ئه‌و كه‌سه‌یه كه هه‌واڵی نادیار "غیب"ه‌كاندا ده‌دات، له هه‌ندێكی ده‌ی پێكی و له زۆرینه‌شی هه‌ڵه ده‌كات، پێشی وایه كه جنۆكه هه‌واڵه‌كانی پێده‌ده‌ن.

٣-فاڵ گرتنه‌وه له زمان و زاراوه‌دا: "العرافة لغة و اصطلاحا":

فاڵ گرتنه‌وه له زمانه‌وانیدا: "العرافة لغة": له زمانی عه‌ره‌بی "عراف" به‌و واتایانه هاتوه، "عرّاف": "كاهن" نهێنزان، پزیشك، "المنجّم" ئه‌ستێره‌ناس له به‌ر شاره‌زایی هه‌ریه‌كه‌یان "پزیشك، منجم" له بواره‌كه‌ی خۆی.(لسان العرب: عرف، الصحاح، النهایة في غریب الحدیث، ج٣ ص٨٩٩).

فاڵ گرتنه‌وه له زاراوه‌دا: "العرافة اصطلاحاً"

پێشه‌وا "البغوی" (ره‌حمه‌تی خوای لێبێ) فه‌رموویه‌تی "العرَّاف" فاڵ گره‌وه: ئه‌و كه‌سه‌یه كه بانگهێشتی شاره‌زایی كاره‌كانی به پێشه‌كیه‌كان "المقدمات" ده‌كات وه ده‌یانكاته به‌ڵگه له سه‌ر دزراو "المسروق" و شوێنی وونبونه‌كه و نمونه‌ی ئه‌وانه‌ش گوتراویشه "العراف" هه‌ر "كاهن"ه .

(عالم السحر و الشعوذة: عمر سلیمان الاشقر: ص٢٦٩)

٤-فێڵ و چاوبه‌سته‌كی و ساخته‌كاری له زمان و زاراوه‌دا "الشعوذة لغة و اصطلاحاً"

*فێڵ و چاوبه‌سته‌كی له زمانه‌وانیدا: "الشعوذة لغة" له

زمانی عەرەبی بەو واتایانە هاتووە:

-خێرایی "سرعه"، شاراوەیی لە کارەکان، نیشاندان و بەرچاوخستنی شتەکان بە جگە لە وێنە و بنەرەتی ڕاستی خۆیان. (لسان العرب: شعذ).

* فێڵ و چاوبەستەکی لە زمانەوانیدا: "الشعوذة اصطلاحاً":بریتیە لە فێڵ و ساختە کاری و چاو بەستەکی و نیشاندانی شتەکان بە جگە لە وێنە و ڕاستیەتی.

٤-ئایا جادوو "سحر" ڕاست و هەقیقەتە یان خەیاڵ و وەهمە:

دوو ڕاو بۆ چون هەیە:

١-زۆربەی زانایانی ئیسلام، بەڵکو هەندێك دەفەرموون بە یەك دەنگی زانایان جادوو "سحر" ڕاستە و هەقیقەتە، بە بەڵگەی قورئان و فەرمووده، بۆ نمونە ئەوە ناوی هەندێك لە زاناکانە: (الامام القرافي، الشيرازي، الخطابي ، ابن تيمية ، ابن القيم، النووي، ابن حجر الهيتمي)

بەڵگەکانیان:-

-خودا فەرموویەتی: ﴿ وَٱتَّبَعُوا۟ مَا تَتْلُوا۟ ٱلشَّيَـٰطِينُ عَلَىٰ مُلْكِ سُلَيْمَـٰنَ ۖ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَـٰنُ وَلَـٰكِنَّ ٱلشَّيَـٰطِينَ كَفَرُوا۟ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحْرَ وَمَآ أُنزِلَ عَلَى ٱلْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَـٰرُوتَ وَمَـٰرُوتَ ۚ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّىٰ يَقُولَآ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلَا تَكْفُرْ ۖ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِۦ بَيْنَ ٱلْمَرْءِ وَزَوْجِهِۦ ۚ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِۦ مِنْ أَحَدٍ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلَا يَنفَعُهُمْ ۚ وَلَقَدْ عَلِمُوا۟ لَمَنِ ٱشْتَرَىٰهُ مَا لَهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنْ خَلَـٰقٍ ۚ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْا۟ بِهِۦٓ أَنفُسَهُمْ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴾ البقره: ١٠٢.

لەو ئایەتە خوا هەواڵی داوە کە شەیتانەکان خەڵکیان فێری "سحر" کردووە، بێ گومان خەڵکی لێیان فێربونە، ئەگەر "سحر" ڕاستی نەبوایە خەڵکی چی فێر بووە؟ شەیتانەکان چیان فێری خەڵکی کردووە؟ ڕاشکاوانە لە دەقەکەی قورئان هاتوە کە جادوکەر "ساحر" هاوسەران لە یەکتر جیا دەکاتەوە، زیان بە خەڵکی دەگەیەنن بە هۆی جادوەکەیان.

-"لبیدی کوڕی الاعصم" لە تیرەی "بنی زریق" جادووی لە پێغەمبەر(ﷺ) بەو هۆیەوە وای دەزانی و خەیاڵی دەکرد فلانە شتی کردوە کە چی نەشی کردووە تا خودای جل جلالە فریشتەی بۆ ڕەوانە کردوو،جادووەکەی ئاشکرا کرد بۆی پێغەمبەر(ﷺ)هاوەڵانی خودا لێیان ڕازی بێت چوون لە بیری "ذروان"موەکانیان دەر هێنا و جادوەکە هەڵوەشایەوە.(صحيح البخاري:٢٣٢،٢٢١.صحيح مسلم: ٢١٨٩).

-پێشەوا "القرافي" فەرموویەتی یەکدەنگی "إجماع" بەڵگەیە لە سەر ئەوەی "سحر" ڕاستی و هەقیقەتە جیاوازی تێدا لە دوای "إجماع"ی هاوەڵان خودا لێیان ڕازی بێ بینراوە لە بەر ئەوەیە جیاوازیەکە ئاوڕی لێ نادرێتەوە و حیسابی بۆ ناکرێ.

*ئەو ڕاو بۆچونە پەسند و "راجح"ە و بەڵگەکانیان بە هێزە "والله اعلم"، تەنها ئەوە ماوە بڵێن کە هەندێك لە جۆرەکانی جادوو خەیاڵە و چاو بەستەکیە، بەلام هەموی نا.

٢-ڕایان وایە هەموو جۆرەکانی "سحر"خەیاڵ و وەهمە نەك هەقیقەت و ڕاستی تەنها ئەو زانایانەن کە ئەو بۆچونەیان هەیە لە گەڵ تاقمی "معتزل"یەکان.

بەڵگەکانیان:

بە گوێرەی ئەو ئایەتانە جادوو تەنها خەیاڵ و چاو بەستەکیە و هیچی تر..خودا فەرموویەتی: ﴿ قَالَ بَلْ أَلْقُوا۟ ۖ فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَىٰ ﴾ طه: ٦٦

خودا فەرموویەتی:

﴿ قَالَ أَلْقُوا۟ ۖ فَلَمَّآ أَلْقَوْا۟ سَحَرُوٓا۟ أَعْيُنَ ٱلنَّاسِ وَٱسْتَرْهَبُوهُمْ وَجَآءُو بِسِحْرٍ عَظِيمٍ ﴾ الاعراف: ١١٦.

**٥-جۆرەکانی جادوو و حوکمی فێربوونی:**

**جۆرەکان جادوو:**

زانایانی ئیسلام دەربارەی دیاری کردنی جۆرەکانی جادوو ژماردنیان جیاوازیان هەیە هەیانە دەڵی: هەشت جۆرە، هەشیانە دەڵێ چوارە جۆرە، هەشیانە ، سێ جۆرە، بە رای ئێمە جوان و پوخترین دیارکردن و ژماردن بۆ جۆرەکانی جادوو هی (د.عمرسلیمان الاشقر) یەکە لە "عالم السحر و الشعوذة:ص١٤٧،١٠٢ " فەرموویەتی: جادوو سێ جۆرە:

**جۆری یەکەم: جادوو ڕاست و هەقیقی "السحر الحقيقي"**

ئەو جۆرە جادووە ڕاست و ڕوو دەدات دوو بەشی هەیە هەر وەك ابن خلدون فەرموویەتی:

ا-بە هیمەت و هەوڵی جادوو کەر بە بێ ئامرازێك و کۆمەکار، کاریگەرە و ڕوودەدات جادووکەر لە دوای کۆشەش و ڕای هێنانی خۆی، دەگاتە ئەوەی کە ئەو جادوو کەر بە کۆمەکی شەیتان کارەکانی دەکات نەك هیممەت و کۆشەشی خۆی.

ب-بە کۆمەکی هەسارە و ئەستێرە دەتوانی جادوەکەی بکات، کار بکاتە سەر جگەی لە خۆی... پێ ی دەگووترێ "الطلسمات" کە بریتیە: لەو هێڵ و ژمارانەی نوسەرەکەی بانگەشەی پا بەندبوونی روحانیەتی هەسارەکانی تر بە روحە نزمەکانەوە پێدەکات و جادووەکەی لە خۆشەویست کردن لابردنی خراپە... هتد پێ ئەنجامدەدات..

ئەوەی ڕاستی بێ ئەوەشیان کاری شەیتانیە نەك لە هەسارە و ئەستێرە بێ گیانەکان ئەوەشی کەوا دەڵێن تەنها بۆ فێڵ و چاو بەستەکی و داپۆشینی گومڕایی و کوفرەکەیانە.

**جۆری دووەم: جادووی خەیاڵ کردن (السحر التخيّل):**

ئەو جۆرە جادووە و ئەو خەیاڵکردنەی کە لێکۆڵە رەوان، لە جادوو باسی دەکەن بە یەکێك لەو دوو ڕێگایانە تەواو دەبێت:

ا-جادوکەر پشت دەبەستێ بە هێزی خەیاڵکردن، بە جۆرێك لە کار کردن کاری تیادا دەکات، جۆرەها خەیاڵ کردن و وێنەی کە خۆی مەبەستیەتی تیادا دادەنێت، لە پاشان دایدەبەزێنێ بۆ هەستی بینەران بە هێزی دەروونی کاریگەر تیایدا، بینەران وای دەبینن کە دەڵی بوونی لە دەرەوە هەیە کە چی هیچش لەوێ نەبووە، لە لای فەیلەسوفەکان بە فێڵ و چاو بەستەکی "الشعوذة، و الشعبذة" ناوی هێنراوە.

ب-گرتن بە چاوەکان "الاخذ بالعيون"

بنیاتی ئەو جۆرە لە سەر ئەوەیە کە هێزی بینین جار وا بەستی بە پێچەوانەی خۆی دەبینی لە بەر هەندێك لە هۆکارە پەیدابوەکان، لە بەر ئەوەشە هەڵەکانی بینین بە چاو زۆرە، نابینی کەسێك لە ناو کەشتیەکە گەر تەماشای لێواری ئاوەکەی بکات و وا دەبینی کە کەشتیەکە وەستاوە و ڕۆخ و لێواری ئاوەکە دەجووڵێ کەواتە وەستاو بە جولاوە دەبینرێ و جولاویش بە وەستاو...

"ابن كثير" ڕەحمەتی خوای لێبێ دەفەرمووێ جادووی جادووکەرانی فیرعەون لەو جۆرە بووە، کە دەقەکانی ڕاشکاون کە جادوەکە هێنانە بە خەیاڵیان بوو گرتنی چاوەکان بوو: ﴿ قَالَ بَلْ أَلْقُوا فَإِذَا حِبَالُهُمْ وَعِصِيُّهُمْ يُخَيَّلُ إِلَيْهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَىٰ ﴾ طـه: ٦٦

بەرەهایی خەیاڵ پێکردنیان لە ئایەتەکەی دەقێکی ڕاشکاوە دەربارەی ئەوەی ڕوودانی جادوو بە سەر چاوەکانی خەڵکی لە ئایەتەکە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی چاوەکانیان خەیاڵیان کردوە بەجگە لە ڕاستی ڕووداو.. زانست لای خودایە.

**جۆری سێیەم: جادووی مجازی "السحر المجازي"**

ئەو جۆرە بە فێڵ ی زانستی و شارەزایی تایبەتمەندیەکانی دروست کراوەکانیان لە سەر شاراوەیی دەست و درۆ بە سەر کەم عەقلەکان دا دەکرێت.

جادوەکە پەتێك دێنێ بە وێنەی مار بە هۆی ئامرازێك دەیجولێنێ، یان دەم و چاوی لە سپیەتی دەگۆڕێ بۆ رەشی بە هۆی روون و چەوریەکی کە لە رووی دەدات یان دەستی دەخاتە ناو ئاگر ناسوتێ چونکە چەوری کردوە بە چەوریەکی بەر هەڵست کار بۆ ئاگر و گەرمیەکە... ئەوە وە نەبێ کار کردنە سەر خەیاڵ و بیری جادوو لێکراو بێ یان جادوو بێ لە چاو کرابێ تا شتەکەی بە پێچەوانەی خۆی ببینێ..

**-حوکمی فێر بوونی جادوو:**

ئەو جۆرە جادوەی کە بە کۆمەکی شەیتانی دەکرێت و جادوو کەرەکە دەبی بە کافر و سرکو تاوان و کاری پیس و قێزە ون ئەنجام بدات فێربوونی بە یەك دەنگی زانایان حەرامە و( کوفر و شرکە).

ئەوەی کە تەنها چاو بەستەکی و "فێڵ"ە و( کوفر و شرك) و زیانی بۆ خەڵکی تیادا نیە، زانایان دەفەرموون ئەویش نا پەسندە و چاکترە نەکرێ و چونکە کات بە فیڕۆدان و درۆ و فێڵی تیایە و هەندێکیش ئەو جۆرەش بە حەرام و قەدەغە دادەنێن.

**<u>-حوکمی چونە لای جادوگەر "ساحر" نهێنزان"کاهن" ، فاڵ گرەوە"عراف"</u>**

قەدەغە و حەرامە چونە لای جادوو کەر و کاهن فاڵ گرەوە بە مەبەستی پرسیار لێ کردنیان و چارەسەری و بڕوا بوون پێیان بە گوێرەی ئەو بەڵگانەی خوارەوە:-

-پێغەمبەر (ﷺ) ئەفەرمووێ: ((من اتى عرافا فسأله عن شيء لم تقبل صلا اربعين ليلة))مسلم(٢٢٣٠).

واتە: ئەوەی بچێتە لای فاڵ گرەوەن پرسیاری دەربارەی شتێك لێ بکات نوێژی چل شەوی لێ وەرناگیرێت.

-پێغەمبەر(ﷺ) ئەفەرمووێ: ((من اتى كاهنا او عرافاً فصدقه فيما يقول فقد كفر بما انزل على محمد)) صحيح الترغيب و الترهيب ٣٠٤٧، و في روايه عن عبدالله بن مسعود (رضي الله عنه) أو ساحراً)) واتە: ئەوەی بچێتە لای کاهینێك یان فاڵ گرەوەیەك بە ڕاستی دابنێ لەو قسەی دەیکات، کافر بووە بەوەی کە دابەزیوە بە سەر محمد(ﷺ) لە گێرانەوەك لە عبدالله کوڕی مەسعود فەرموویەتی یان بچیتە لای ساحر.

-ئایا تێك کردنەوەی هەندێك لە هەواڵ و قسەکانی (کاهن) لە گەڵ ڕووداو واقع و ڕاست بێ، دەبێتە مایەی بڕوا بوون پێ ی یان نا؟

عائیشەی دایکمان (خودا لێی ڕازی بێت) فەرمویەتی: ((خەلکێك دەربارەی کاهینەکان پرسیاریان لە پێغەمبەر(ﷺ)کرد ئەویش فەرمووی: هیچ نیە، گوتیان ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاهینەکان هەندێك جار شتێکمان پێ دەڵێن ڕەوایە پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی ئەو ووشەیەی ڕەوایە جنۆکە دەیرفێنێ و دەیخاتە گوێچکەی دۆستەکەی "کە کاهینەکەیە" ئەویش سەد درۆی وەگەڵ دەخا)) البخاري٥٧٦٢.

**٧-چارەسەری جادوو لە پێش و تووشبون و دوای توشبون.**

-باشترین ڕێگا شەرعیەکان بۆ خۆ پاراستن لە جادوو جادووکەران:

جادو جادووکەران کارەکەو کەسەکەی لە شەیتانەوەیە جا چۆن موسڵمان خۆی لە شەیتان و کار پێکراوەکانی دەپارێزێ ئەوە چاکترین ڕێگایە بۆ ئەو کەسە:-

١-خۆ بە خۆپەنادان لە شەیتان و داو تەلەکەی شەیتان و زۆر گۆتنی (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم).

٢-پارێزکاری و لە خودا ترسان ئەوەی وا بکات خودا دەبێتە پشتوانی و دەیپارێزێ.

٣-پــشت بەسـتان و بـە خـودا ئەوەی وا بكات خودا بەسیەتی.

٤-گەڕانەوە و تەوبە لە تاوانەكان گونەهانەكان دەرگان بۆ شەیتان.

٥-خێرو چاكە و صەدەقە كردن بەردەوام بە هەموو جۆرەكانیەوە.

٦-بونــە خــاوەنی یەكتایــەكی تـەواو بـە هـەموو جۆرەكانیـەوە و توحیدێكی تەواو پتەوت هەبێت .

٧-زۆر خوێندنــەوەی قورئــان و ووردو نزا جێگرەكان.

-ڕێگــا چــارەی شــەرعی بــۆ جــادوولێكراو "المــسحور" لــە دوای تووش بوون:-

١-جادوو لێكراو چ بۆ خۆی یان بــچێتە لای چارەســەركارێكی متمانە شەرعی تاكو روقیەی بۆ بكــرێ بــەڵكو جادوەكــەی هەڵدەوەشێنێتەوە.

٢-ئەگـەر جادوەكـە پـێ دەزانـێ دەربهێنێ و پوچەڵی بكاتەوە، ئەو جۆرەش گەر كرا زۆر كاریگەرە بۆ هەڵوەشاندنەوەی جادوەكە.

٣-بــەكارهێنانی هەنــدێك لــە دەرمانــە ڕێگـا دراوەكـانی وەكـو خـواردنی حــەوت لــە قەسـپی "عجوة" لە خورێنی.

٤-خــۆ چارەســەر كــردن بــە كەلەشــــاخ "الحجامــــة" و نەشتەرگەری ئەگـەر شـوێنەواری جادوەكە لە ئەندامێكی دەركەوت ئەوا دەتواندرێ بە كەلە شاخ یان برینـدار كردنـی شـوێنەكە لـە لای كەسێكی شارەزاو لێزان چارەسەر بكرێت.

-چەپكێك لە ئایەت و وورد و نزاكـــانی ســوود بــەخش بــۆ جــادوو لــە پــێش توشـبون و لـە دوا توش بوون

-قورئــانی پــیرۆز هەمووی شیفا و چارەسەریە:-

١-"اعـوذ بـالله مـن الـشیطان الـرجیم" ٢- بـسم الله كـردن. ٣- خوێندنەوەی سوڕەتی "البقرة".

٤-خوێندنـــــەوەی ســــوڕەتی "الفاتحــــة". ٥-خوێندنــــەوەی ئایـەتی كورسـی. ٦-دوو ئایـەتی كۆتـایی سـوڕەتی "البقـره". ٧- خوێندنــــەوەی ســـوڕەتەكانی "الاخــلاص و المعــوذتین". ٨- خوێندنــەوەی ئایەتــەكانی كــە ووشـــــەی پووچـــــەڵكردنەوەی جادویـان تیایـە: (الاعـراف:١١٨، ١١٩، یــــس:٨١، طــــه:٦٩). خوێندنەوەی ووردەكانی بەیانیان و ئێواران بە بەردەوامی.

٨-نیــشانەكانی ناســینەوەی "ساحر" و "كاهن" و فالْ گرەوە.

گـەر چوویتە لای هـەر چارەسـەر كـارێكی ئەگـەر نەتـدەزانی ئایـا متمانەی شەرعیە یان جادووكەر و فــالْ گرەوەیــەن ئــەوە بــەو نیـشانانە بیـان ناسـەو ئەگـەر یـەكێك لـەو نیشانەی لێ هاتـە جێ ئەوە بێ گومان بزانە جادو گەر و فالْ گرەوەیە:-



١-پرسیار ناوی خۆی و دایكی لە نەخۆش دەكا.

٢-پارچــەیەك یــان شــتێك لــە شـــوێنەوارەكانی نـــەخۆش داوا بكات وەربگرێ چ لە "جل و بەرگ یان لە كڵاوی یان لە موەكانی.."

٣-داوا كردنـــی ئاژەڵێـــك یـــان باڵندەیەك كە بە وەسفی تایبەتی خـۆی لـە ڕەنـگ و شـێوە و تـا بیكوژێتەوە و بە بێ ناوی خودا، خوێنەكــــەی شــــوێن ژانـــی نەخۆشەكە پێ چەوردەكات.

٤-نوسینەوەی "طلاسم" پیت و نەخشە و هێڵی جۆرا و جۆر.

٥-خوێندنەوەی دوعا و نوشتەی كە لە ماناكەی تێ نەگەیت.

٦-جوببە "حجاب" دانە نەخۆش كە چوار گۆشەی تیا بێ لە ناو چوار گۆشـەكان پیـت و ژمـارەی هەبێ

٧-داوا كـردن لـە نـەخۆش كـە گۆشـە گـیر بـێ ماوەیـەكی دیـار كـراو لـە ژوورێكـی كـە هـەتاو و خۆری لێ نەدا.

٨-داوا کردنـی لـه نـه‌خۆش کـه دەست لـه ئاو نه‌دات ماوەیەکی دیـار کـراو جـار وایـه بـۆ مـاوەی "٤٠" چل ڕۆژ.

٩-چه‌ند شتێك ده‌داته نه‌خۆش تاكو ژێر خاكیان بكا.



١٠-هەوڵ دان بە نەخۆشەکەی کە پێی بڵێ تۆ ناوت و خه‌ڵکی فلان شوێنی کێشەکەت ئەوەیە کە لە پێناو هاتووی

١١-نوسنەوەی پیتی پچر پچر له پەرێك یان قاپ و سنەیەکی مزی سـپی لـه دوای تاواندنـــەوەی نوشـتەکە تیایــدا فـەرمان بـه نەخۆشەکە دەکات بیخواتەوە.

یــان گـــەر هـــەر دەتزانـــی کـــه فەرمانەکانی خـودا جـێ بـەجێ ناكــات وز خــاوەن تــاوانی زۆر مەزنـــه، ئـــەوە بـــه دڵنیایـــەوە خوداکـەس ئـاوا خـۆش نـاوێ یارمەتیـشی نـادات مەچـوە لای خۆتی لێ دوور بگرە.

٩-ئاگـادار کردنـەوە لـه چـەندین خـاڵ و نوشـتەی داهێنـراوی بـێ شەرعی.

داوا له نەخۆش و چارەسەرکاران دەکەم خۆیـان لـەو ڕێگـا و کـار و نوشـتانه بپـارێزن گـه دیاریـان دەکـەین، بـەڵکو تـەنها ڕێگـای شـەرعی و دروست بگرنـه بـەر بـۆ چارەسەری:-

١-هەندێك كەس پێیان وایه چ به خۆی یان کەسێك هەیه جنوکه به چــاو دەبیــنن بـی بـێ پــەردە، ئــەوە ڕاسـت و دروست نی یه، له بیروباوەری "أهل السنة و الجماعـة" بروانـه مـدارج الـسالكين: ٢٢١/٣.

٢-بڕوا بوون به له دەست کردنی مــز یــا پارچــه پەڕۆیــەك بــۆ نەهێشتنی چاو زارو پەرکەم.

٣-بـڕوا بـوون بـه هەڵواسـینی چاوێکی شین له ئوتومبێل و یان لـه ماڵـەوە یـان دوکـان و هـەر شـوێنێك دروسـت نـی یـه لـه بـەر چاوو جادوو.

٤-نوسـنەوەی ئایـەتی کورسـی و دوو سوڕەتەکانی "المعوذتين" لـه پـەرێك و دانـانی لـه نـاو غـلاف و بـەرگێك و هـەڵگرتنی لـه جانتـا و گیرفـــان بـــه مەبەســـتی ڕەت کردنەوەی خراپە و بەڵا.

٥-ئایـەتی الکرسی کردنە ملوانکە و لـه ملـی منـالان بکرێـت یـان گەوران بۆ پاراستن.

٦-دانـانی قورئـانی پـیرۆز لـه ژوورەوە یان له ناو ئوتومبێل به مەبەستی خۆ پارێزی.

٧-هەڵواسـینی سمـی وولاغ یـان پـێڵاوی منـداڵ لـه سـەر دەرانـی دەرگا یان له ناو ئوتومبێل.

٨-نوشتەی "أبو دجانة" که به ناوبانگـه لـه بـاوکی موسـی الانـصاری کـه گوایـه پێغەمبـەر (ﷺ) نوسـراوێکی پێـدا تـاکو بیپارێزی لـه شـەیتان و جنۆکـه. بـەلام ئـەم فەرموودەیـه ڕاسـت و هەڵبەستراوە "موضـوع" هـەروەکو پێـشەوا "الحــافظ البيهقـــي" (ڕەحمـەتی خـوای لـێبێ)فەرموویـەتی ((روى في حرز أبى دجانة حديث طويـل و هـو موضـوع لا تحـل روايته)) "دلائل النبوة للبيهقي: ١١٨/٧".

واتـه: گێڕدراوەتـەوە دەربـارەی پـــارێزی بـــاوکی دوجانــــه فەرموودەیەکی درێژ کە داهێنراوە و هەڵبـــستراوە گێرانەوەکـــەش دروست نییه.



# ڕاپۆرتێکی ئەمریکی ترسی ناو دونیا دەوروژێنێتەوە

## ڕاپۆرتێکی ئەمریکی چاودێری دیاردەیەکی ترسناک دەکات

## کۆتایی گەردوون لە ماوەی ( ٥٠ ) ساڵ

ئا/ م. یعقوب

چەند برگەیەك و چەند پارچەیەکی بچوك کە گۆڤاری ئۆبزێڤەری بەریتانی بڵاوی کردۆتەوە لەو دواییانەدا ، ئەمەشیان ڕاپۆرتێکی نهێنی بووە بۆ پنتاگۆن کە ترسێکی گەورەی پەیدا کردووە لە وڵاتی ئەوروپاو وڵاتە یەکگرتووەکان ... ئەم هەواڵەش پاڵی بە زۆرێك لە خەڵکی وڵاتە ئەوروپییەکان ناوە ، بۆ ئەوەی داوا بکەن لە (واشنگون) کەوا دەققی ڕاپۆرتەکە بڵاوبکاتەوە ، کە بووەتە هۆی تەنگرژەو دەنگە دەنگ لەناو مەلایین ئەمەریکی و ئەوروپییەکان ، هەر چەندە ناکۆکیەکی زۆر هەیە لە وڵاتە ڕۆژئاواییەکان لەسەر ئەو ڕاپۆرتەی کە بڵاوبۆتەوە ، بۆیە تا ئێستا وڵاتە یەکگرتووەکان ڕەفزی ئەوەی کردووە کە ڕاپۆرتەکە بڵاوبکاتەوە .

ئەم ڕاپۆرتەش کەوا جێگەی قسەیە لە جیهان دا لە کۆتایی ساڵەکانی ڕابردوو دەرچووە و جیهان و گەردوونەی کە تیایدا دەژین لەناو دەچێت و نامێنێت پاش(٥٠)ساڵ .

وە ئەو گۆڕانکاریانەی کە پەیوەندی بە کەش و هەواوە هەیە سەر دەکێشێت بۆ لەناو چوونی چەند وڵاتێك و بە دەرکەوتنی چەند وڵاتێکی تر[1] ، مرۆڤایەتیش دەگەڕێتەوە سەردەمەکانی پەیدابوونی مرۆڤ و ژیانەکانی سەرەتایی[2] ، ئەم زانیاریانەش بە هۆی گۆڕانکاری کەش و هەوا و ، هەسارەکانی تر بە دەرکەوتووە ، جا ئەڵێن : بە دەرکەوتووە کەوا گۆڕانکاریەکی زۆر ڕوویداوە لە هەسارەکان[3] بە هۆی کەش و هەواوە .

جگە لەوەی تەماشایان کردووە کەوا زۆرێك لە نەیازیك و پارچە ئەستێرە دەکەوێتە خوارەوە ، ئەم نەیازیکانەش کەوا زۆر بەهێزە لە داهاتوودا دەکەوێتە خوارەوە لە زۆر لایەنی جیا جیا لەسەر زەوی

لە ڕاپۆرتەکەدا هاتووە کەوا ووزەیەکی تاریك دەستی بە جولان کردووە لە ساڵی (٢٠٠٣) ، هەر چەندە پێشتر بەلایین ساڵە کە

---

[1] واتە : ئەو کۆمەڵە وڵاتانە لەناو دەچن و کۆمەڵە وڵاتێکی تر دروست دەبن و پەیدا دەبن .

[2] واتە : ئەو تەکنەلۆجیایەی کە ئێستا هەیە لەناو دەچێت و نامێنێت ، مرۆڤ لەسەرەتادا چۆن دروست بووە ئاواش دەگەڕێتەوە ، ئەمەش بە حەسەب فیکری خۆیان ، چونکە ئەوان دەیانووت : مرۆڤ لە سەرەتادا هیچی نەدەزانی ، بەڵام بە حەسەب ئیسلام وا نی یە چونکە خوای پەروەردگار هەموو شتێکی فێری ئادەم کرد ، وەك و ئەفەرمووی : ﴿وعلم آدم الأسماء كلها .....﴾ .

[2] جیاوازی نێوان هەسارە و ئەستێرە ؟
هەسارە : ڕووناکی لەخۆی نی یە ، بەڵکو ڕووناکی لە ڕۆژ وەردەگرێت وەك و ئەو زەویەی ئێمە لەسەری دەژین ئەوە هەسارەیە و ڕووناکی لە خۆر وەردەگرێت
ئەستێرە : ڕووناکی لە خۆیەتی و پڕشنگ دارە پێویستی بە خۆر نی یە .

تا ئێستا ئەو هێزەی نەبووە و ئەو ووزەیەی لیّ پەیدا نەبووە .

ئەو راپۆرتەی کە جێگەی تێروانینە زۆر پرسیار پەیدا ئەکات دەربارەی ژیانی مرۆڤ لە سەر رووی زەوی ، کەوا تەوەقوع دەکرێت بە هۆی ئەو (احتباس الحراري)یەی کە زەوی بچێتە قۆناغێکی نویّ ، کە مرۆڤ ناتوانێت لەگەڵ ئەو کەش و هەوایەدا بژیت .

راپۆرتەکە وا دەبینێت کە مەنگیقهی (شرق الوسگ) کە منگیقهی ووڵاتە موسڵمانەکانە ، زۆر بومەلەرزەو شتی تر تیایدا رووبدات ، بەڵام لە هەموو جێگایەك ئەمینتر دەبێت لەسەر رووی زەوی بەرامبەر ئەو گۆرانکاریانەی کە لەسەر زەوی دا روودەدات .

بەڵام ئەوەی جێگای سەرنجە پێش ئەوەی بچینە ناو ئەو ووردەکاریانە ، ئەو راپۆرتە عەسکەریەکان ئامادەیان نەکردووە لە پنتاگۆن ، بەڵکو گەیشتۆتە ئەو ئەنجامەی کەوا لە ماوەی پوختەی چەند لێکۆڵینەوەو توێژینەوەیەك کە (١٢) ساڵی تەواو بەردەوام بووە ، ئەمەشیان پرۆژەیەکی نویّ بووە کە پنتاگۆن[4] پشتگیری کردووە لە ساڵی (١٩٩٢) ، ئەو توێژینەوەیەش نزیکەی (١٢) ساڵی تەواو خەریك بوون .

هەروەها چاودێری کردنی کەش و هەوا کە روو لە زەوی دەکات ، ئەمەش لە خیلالی هەسارەکانی تر کە گۆرانکاریان بەسەر هاتووە ، هەروەها زەویش تووشی ئەو گۆرانکاریانە دەبێت بە تایبەتی لە مانگ و مەریخ لە رێگەی چەند کەشتیەکی ئاسمانی کە ئەمریکا بە نهێنی رەوانی کردووە ، بۆ ئەوەی ئاسمانی زەوی ببەزێنێت و بچێت بۆ چەند هەسارەیەك .

هەروەها منگیقهی (معتمە) کەوا جێگایەکی تاریکە و رووناکی نایگاتیّ ، ئەوانەی بەو کەشتیە ئاسمانیانە دەچنە بۆشایی ئاسمان چەندەها ئامێری فەنی وورد و تەکنەلۆجیای نویّ بە کەشتیە ئاسمانیەکانەوە بەستراوە ، کە پێشتر بە ئاشکرا نهێنیەکانیان نەدرکاند بوو ئەمەشیان لە سەنتەرێکی ویلایەتی (فلۆریدا) ئەنجامیان دابوو ، ئەم سەنتەرەش نزیکەی (١٥٠٠) زانای تایبەتمەندی لە خۆی گرتبوو کەوا پسپۆر بوون



لەو بوارەدا ئەم زانایانەش پوختەی عەقڵی بەشەری بوون[*] ، بۆیە زۆربەی زۆری زاناکان (ئەمریکی و ئەوروپی و ئەفەریقی و ئاسیاوی) بوون ، بۆیە ئەم پرۆژەیەش (١٧) ملیۆن دۆلاری تێدا سەرف کراوە ، جگە لەو زانایانەی کە سەر پەرشتی ئەو پرۆژەیان کردووە بە بەشی فەنیەوە کە سەپەرشتی دەکەن بە گرتنی وێنەکانی قەمەری صناعی و ئەو کەشتیانەی کە رەوانە کراینە و ، ئەو سەرپەرشتی کارانەی کە کاریان لەسەر کردووە

[4] وەزیری دیفاعی ئەمەریکی .

[*] بە شێوازێکی تر بڵێین : ئەوانە پوختەی زانایان بوون کە لەم سەنتەرەدا بەشداریان کردبوو .

(٣) لـــه گـــه‌وره‌ترین زانایـــانی سروشـــتین لـــه (واشـــنطون) كـــه ئه‌مانه‌ن (دایث تاریـال * سـولانا مـــروزي * فتمولـــون ماشـــینن) ، هـــه‌روه‌ها هـــه‌موو توانایه‌كیـشیان خـــستبۆوه بـــه‌ر ده‌ســـتی ئـــه‌م زانایانـــه بـــۆ ئـــه‌وه‌ی كۆتـــایی بـــه‌م ڕاپۆرته بهێنن .

جا یه‌كێ له‌و سه‌نته‌رانه‌ی كه بۆ ئه‌م ڕاپۆرته دانرابوو له طابقی (١٦)م بوو ، كه‌وا یه‌كێك بوو له‌و بورجانه‌ی كه ته‌قێنرایه‌وه له (١١)ی سێبته‌مبه‌ری ساڵی (٢٠٠١) .

جا ئه‌م بورجه مه‌ركه‌زێك بوو له‌و مه‌ركه‌زانه‌ی كه لێكۆڵینه‌وه‌ی ڕاپۆرته‌كه‌ی لێوه كرا جگه له‌وه‌ش ئه‌و به‌شه فه‌نیه‌ی كه سه‌رپه‌رشتیان ده‌كرد په‌یوه‌ندیان هه‌بوو له‌گه‌ڵ زانایانی سروشتی و زانایانی (فضاء) له (به‌ریتانیا و فه‌ڕه‌نسا و ئیتاڵیا و یۆنان و هۆڵه‌ندا و ئه‌ڵمانیا و مالطا و .....) ، هه‌روه‌ها له‌م پرۆژه‌یه‌دا (٣) زانای شاره‌زای ئیسرائیلیشیان له‌گه‌ڵ بوو ، ئه‌و گرووپه‌ش پشتگیری كرابوو به دوو له زانایانی لاهوتی[٦] ئایینی ، بۆ زانین و تێڕوانینی ئایین و شه‌رع بۆ ئه‌وه‌ی بزانن ئایا له ئاینه‌كانیاندا شتی وا باس ئه‌كات

بۆیه داوایان له هه‌ندێ له زانایانی موسڵمانیان كرد بۆ ئه‌وه‌ی به‌شداری بكه‌ن له‌م ڕاپۆرته ، به‌ڵام موسڵمانه‌كان ڕه‌فزیان كرد كه به‌شدار ی له‌و ڕاپۆرته بكه‌ن ، به‌ڵام توانیان زانایه‌ك ی بیركاری موسڵما نی



ئه‌مه‌ریكی بهێنن كه له بنچینه‌دا باوك و باپیرانی خه‌ڵكی ئاسیا بوون ، وه شاره‌زایی له زانستی قورئان و مانای قورئان هه‌بوو ، ئه‌و ڕاپۆرته نهێنی بوو ، به‌ڵام با بزانین چی لێ هات ؟

هه‌ر چه‌نده پنتاگۆن توانی بۆ ماوه‌ی (١٠) ساڵ پرۆژه‌ی ئه‌م نهێنیه ڕانه‌گه‌یه‌نێت ، به‌ڵام له‌م ساڵانه‌ی ڕابردوو چه‌ند زانیاریه‌كی جیا جیا بڵاوده‌بۆوه ده‌رباره‌ی ئه‌و پرۆژه‌ی كه پێشتر نه‌زانرابوو .

جا با بزانین بۆچی ئه‌مریكا ئه‌و ڕاپۆرته‌ی به نهێنی هێشتۆته‌وه ؟ وه توێژینه‌وه‌ی پرۆژه‌كه‌ی پنتاگۆن ئامانجه‌كه‌ی چی بوو ؟

له وه‌ڵامدا ئه‌ڵێن : ئامانجه‌كه‌ی ده‌ست گرتن بوو به‌سه‌ر ده‌سه‌ڵات دا له‌سه‌ر زانسته‌كانی (فضاء) ، چونكه زانستی (فضاء) یه‌كێكه له بنه‌ماو پێشكه‌وتنی زانستی له فه‌تره‌ی داهاتوو .

به‌ڵام به ده‌ركه‌وت كه ئه‌نجامه‌كه ڕاست نی یه له‌وه‌ی كه گه‌یشتنێ ، چونكه ڕاپۆرته نهێنیه‌كه كه دانرابوو چه‌ند ئه‌نجامێكی لێ په‌یدا بوو ، ئه‌و ئه‌نجامه‌ش په‌یوه‌ندی به سه‌یگره‌كردنی نی ی له‌سه‌ر (فضاء) .

بۆیه هه‌ندێك له وڵاتانی ڕۆژئاوا پرسیاریان ده‌كرد و ده‌یانووت : ئـــه‌وه‌ی ئه‌مـــه‌ریكا لـــه (الشـــرق الأوسـط)[٧] ده‌یكـات ، ئایـا ئـه‌وه

---

[٦] زانایانی مه‌سیحی یان (گاوڕ) .

[٧] مه‌به‌ستی وڵـاتی ئه‌فغانستان و عێراق و ئێران ......هتد .

یەکێکە لەو ئەنجامەی ئەو راپۆرتە[٨] ؟

لە وەڵامیاندا ئەڵێن : ئیحتیمالی هەیە ، چونکە هەندێك خەڵك ئەو زانیاریانەیان پێ غەریب و نامۆیە و ، ئەڵێن : نزیکترە لە خەیاڵ نەك راستی ، هەرچەندە زۆرێك باوەڕی ناکەن ، بەڵام بڕیاردان لەسەر ئەم زانیاریانە ئایا راستە یان راست نی یە ئەوە مێژوو بڕیار لەسەر ئەدات لەسەر ئەو (٥٠) ساڵەی کە دادێت .

لەبەر ئەوەی ئێمە ئەو زانیاریانە بڵاودەکەینەوە کە لەسەر راپۆرتەکە هاتووە ، چونکە جێگای ئاگاداریە ، ئێستاش قسەی زیاتری لەسەرە لەناو دائیرەکانی ئەوروپییەکان و ئەمەریکیەکان .

بۆیە لە یەکەم دێری راپۆرتەکە ئەنووسن (نهایە العالم تبدوا قریبە) واتە : کۆتایی جیهان بە دەردەکەوێت کە نزیك بوو بێت .

لە راپۆرتەکەدا ئەڵێ : چەند گۆڕانکاریەکی زۆر بەهێز هەیە کەوا سەر دەکێشێت بۆ وەرگێڕانی تەوازوون لەسەر هەموو رووی زەوی ، وە زۆرێك وەردەگێردرێت لە دیاردەکانی شارستانیەتی مرۆڤایەتی و پێشکەوتنی زانستی ، ئەو پێشکەوتنە تەکنەلۆجیایەی کە ئێستا هەیە موهەددەدە بە لەناو چوون و تێك چوون لە چەند ساڵی داهاتوودا .

بۆیە هەموو بیر و تێگەیشتنی مرۆڤ و ، هەموو ئامێرە نوێ یەکان ئەیانەوێ ژێر دەست بکرێن بۆ خزمەتکردنی رزگارکردنی بەشەریەت لەو لەناو چوونەی کە پێش بینی دەکرێت .

هەروەها لە راپۆرتەکەدا ئەڵێ : دیتراوە و چاودێری کراوە کەوا بە مەلایین نەیازیك و بەردی گەورەو بچوك بە خێرایی بەرەو رووی هەسارەی زەوی دێن و بە یەکتر کەوتوونە ، بۆیە هەندێك لە دیاردەی ئەو لەناو چوونە کە لەسەر زەوی هەستی پێناکرێت روویداوە[٩] .

بەڵام چاودێری خوای پەروەردگارە کە لە ئەنجامی ئەو پێکدادانەی نەیازیکەکانی پاراستووە لە زەوی ، بەڵام وا بەدیار دەکەوێت مەلایین جسمی کەونی دیکە چاوەڕێ دەکەن کە بەرەو رووی زەوی بێن ، ئەو جیسمانەش کاتێ کە دێن حەرەکەی زەوی راناگرێت و لە رۆیشتندا زۆر بەهێزە ، وای لێدێت هیچ هەسارەیەك و هیچ نەیازیکێکی تر خۆی لەبەر راناگرێت .

جا بە پێ ی ئەو هەڵێنجانە زانستیەی کە هەیە ئەم جیسمانە لە زەوی دەدات لە (٢٥) ساڵی داهاتوو ، چونکە بەلایین کیلۆمەتر دەڕوا ، بۆیە هەرچەند لە زەوی نزیك بێتەوە گۆڕانکاری زیاتر لە کەش و هەوا روو دەدات[١٠] ، بۆیە هەندێك گۆڕانکاری رووی داوە ، ئەم گۆڕانکاریانەش تیژتر و بە هێزتر دەبن لە (١٠) ساڵی داهاتوو ، ئەمەش بە پێ ی ئەم گۆڕانکاریانەی کە روودەدات لە خیلالی چەند بیردۆزێکی زانستی کە لە چەند بناغەیەکی ئەو (نظریاتانە) زەوی بەش بەش کراوە بۆ چەند زاویە و دەوائیر[١١] ، ئەمەش بە پێی زانستی کە ئەو مەنگیقانە زەریا و دەریاکان دەورێکی زۆر گەورەیان هەبوو بۆ تەکوین بوون[١٢] .

[٨] واتە : کە زانیتی (شرق الأوسط) لە هەموو جێگایەك ئەمینترە و دەیەوێت دەسەڵاتی لەسەر هەبێت ، بۆ ئەوەی جێی پێی خۆی بکاتەوە لە (شرق الأوسط).

[٩] واتە : لە دەورو بەری زەوی روویداوە .

[١٠] واتە : ئێستا لەوانەیە زۆر دوور بێت ، بەڵام لە چاو پێشتر زۆر زۆر نزیك ترە .

[١١] واتە : زەوی دابەش کراوە بۆ چەند مەنطیقەیەك بە پێی نەضەری زانستی .

[١٢] واتە : رۆژێك لە رۆژان ئەو مەنطیقانە نەبوون ، بەڵام ئەو موحیط و دەریایانە دروستیان کردوونەو گۆڕانکاریان تێدا کردووە .

جا چەند مەنگیقهیەك هەیە كە زەریاكـان و دەریاكـان تەئـسیری لێكردوونە ، ئەنجا گەیشتنە ئەو




ئەنجامــەی كــەوا دەریاچــەی ئەتەڵەسی یەكێكە لـە ترسـێنەرە گـەورەكان لـە فـەترەی داهـاتوو ، بۆیــە بــە پــێ ی هەڵـسەنگاندنی زانستی ئـاوی زەریـا و دەریاكـان بەرز دەبێتەوە چەند قات لـەوەی كــە ئێــستا لەســەرە ، ئــەو زیادبوونـەش سەردەكێـشێت بـۆ مـستەوای ئاسـتی ئاوەكـە ، جـا ئـاوی دەریاكـان ئەوەنـدە بـەرز دەبێت كە لەوانەیە (٢٠) هێنـدەی ئێستا بەرزتربێت .

بــەڵام ئــەوەی كــە لــە هــەمووی ترسناكترە ئەو ئاوانەیە كە نزیكن لــە وویلایــەتی موتەحیــدە ، وە هەندێكیشیان دەڵێن : پێش بینی دەكرێت كە (٤٠) هێنـدەی ئێـستا ئـاوی دەریـا و زەریاكـان بـەرزتر بێـــت و ، لـــە ٨٠٪ ی زەوی دەكەوێتە حاڵەتێكی ترسناك .

یـان بڵـێین : لافـاوێكی زۆر گـەورە وەك و شۆڕشـێك دێـت هـەروەك و لــە ڕاپۆرتەكــەدا دەری بڕیــوە ، چونكە ئەم لافاوە دارەكان لە ڕەگ و ڕیـشە دەردەهێنێـت و ، زۆر بـە خێرایـی بینـاو باڵەخانـــەكان دەڕووخێنێـت ، وە ئـــــەو باڵەخانـــــەی كـەوا نـەوین و بڵند نین ئەوانە نقـوم ئـەبن لـە ژێـر ئاوەكـەدا ، ئەوانـەی كـەوا بڵنـد و گەورەشـن ئەیان ڕووخێنێت .

وە دیاردەیـــەكی ترســـناك تـــر ئەوەیـــە كـــە كـــەش و هـــەوا و گۆڕانكاری بارانەكە ئەوەنـدە زۆر دەبێـت كە تەهدیـدی هـەموو ئـەو وڵاتانــە دەكــات بــە تایبــەتی (إنهمـــار المطـــري) واتـــە : بــەردەوامبوونی بــاران كــە بــە تایبـەتی لـە بەشـی ئـەورووپا و ئـەمریكا و بەشـێك لە ئاسـیا كـە وڵاتی (صین)ە ، ئەویش تووش دەبن .

جوولەی زەوی

پاڵنـــەری ســـەرەكی بـــۆ ئـــەو دیاردەیـەی كـە ووتمـان (إنهمـار المگری) ڕاپۆرتەكە ئاماژە بۆ ئەوە ئــەكات كــە گۆڕانكاریــەكی زۆر توونــد و بــەهێز لــە هەســارە نزیكـــەكانی دەوروبـــەری زەوی ڕوودەدات[١٢] .

ئەمــەش كــە ڕووی دا زەوی بــە حەڕەكە دەكـەوێ بـە پـێ ی ئـەو ئەستێرانەی دەوروبەری[١٤] ، بەڵام ئەگـەر گۆڕانكـاری ڕوویـدا ئـەوا تەئسیر لە زەویش دەكات .

جا هۆیەكە لێرەدا بە دەردەكەوێت كـەوا ئـاو لــەو چـوار چـێوەیە نامێنێتــەوە كــەوا پــشك پــشك ببارێت لە ئاسمان و بكەوێتە سەر زەوی وەك و ئێـستا ، بـەڵكو وای لێـدێت بـاران وەك و شـەلالات لـە ئاسمـان دێتـە خـوارەوە ، ئەمـەش ئـاوا قـوڵ دەبێـت لـە ئـەمریكا و ئـەوڕوپا هـەتا وای لێـدێت دێتـە مــــستەوای زەوی ، چــــونكە مـستەوای دەیاكـان و زەریاكـان زیـاتر لە ٥&٦ ئەوەنـدەی لێـدێت كە ئێستا هەیە[١٥] .

بۆیــە ئــەو شــەلالاتانە وەهــا كۆدەبێتـەوە لەسـەر بەشێكی جیا جیا لە مستەوای كەونی بوونەوەر لـە سـەرەوەی ئاسمـان كـە لـە زەویەوە دوورە .

---

[١٢] وەك و عطـــار و مــــەریخ و زوهـــرە و ......هتد .

[١٤] وەك و ڕۆژ كـەوا جـاذبیـەتێكی لـە زەوی هەیــە بۆیــە لــە دەورو بــەری خــۆی دەیسوڕێنێت ، چونكە هیچ ئەستێرەیەكی تر لە نێوانی نی یە .

[١٥] واتـە : ئـاوی دەریایـەك چـەندە ٥&٦ لێدێت ئەو بارانەی كە دەبارێت .

به پێی ئەو زانیاریانەی كەوا دەركەوتووە ئەو ئەجهیزە فەنیانە و ووردەكاریانە دووپاتیان كردۆتەوە كە كەشتیە ئاسمانیە ئەمەریكیەكان جیهازی ووردیان لەگەڵ رەبگ كراوە ، ئەم كەشتیە ئاسمانیانە رەوانە كراون بۆ دەرەوەی زەوی و چووتە ناو بۆشایی ئاسمان .

لە كاتی رەوانە كردنی ئەم كەشتیە ئاسمانیانە دەركەوتووە كە لە بۆشایی ئاسماندا چەند پارچە هەورێك كۆبووەتەوە ، زانایانیش ناویان لەم پارچە هەورە ناوە (سحب) بۆ ئەوەی ئێمە لە رووی زانستی ووردبین كەوا هیچ سەرچاوەیەكی ئاوی نی یە زیاد بكات و سەر بەخۆ دروست بووە لە بۆشایی ئاسمان دا ، لە راپۆرتەكەدا ئەڵێت : ئەمە(٤) ساڵە ئەم پەلە هەورانە كۆدەبێتەوە ، ئەمەش دەبێتە هۆی ئەو دیاردە ترسناكەی كە ووتمان : (إنهمار المگری) ، بەڵام راپۆرتەكە دووپاتی دەكاتەوە كەوا بەشێك لەو دیاردەیە پێش زیاتر لە ملیۆنێك ساڵ روویدابوو

لەگەڵ ئەوەش دا ئەو گۆرانكاریانەی كە رووی داوە پێشتر بەو هێز و توانایە نەبووە كە لە داهاتوودا روودەدات ، بەڵام چەند شارستانیەتێك هەبوون لەناو چوون ، بۆیە زۆرێك لە زەوی كەوتە ناو دەریاكان و زەریاكان .

هەروەها بەشێكی زۆر لە ووڵاتە یەكگرتووەكان دەبێتە بەشێك لە ئاو واتە : نقوم دەبێت ، وە زەوی ئەمریكی زیاتر لە پانتاییەكەی یەك لەسەر سێ ی زەوی لە دەست دەدات ، ئەمەش زانیاریەكی گەشبینانەمان كردووە لەوانەیە زیاتریش بێت ، بەڵام لە لایەكی تر دیاردەی (احتباس الحراری)[١٦] بە شێوەیەكی وورترو قوڵتر بڵاودەبێتەوە ، ئەمەش سەر دەكێشێتە ئەوەی كەوا بەشێكی تری ئەمریكا لەناو بچێت ، هەتا وای لێدێت ئۆكسجین كەم دەبێتەوە لەسەر زەوی ، هەتا وای لێدێت لەگەڵ ئەو بارانە زۆرەی كە دەبارێ وەك و شەلالات لەگەڵ تێكەڵاوبوون و بەرزبوونەوەی پلەی گەرما و گۆرانی كەش و هەوا بە شێوەیەكی زۆر بەهێز كە پێش بینی نەكراوە .

هەروەها ئەو غاز و هەوایەی كە تەوازونەكەی خۆی دەپارێزێ بۆ مرۆڤ خەلەلێكی زۆر گەورەی دەكەوتێ ، چونكە تێكچوونی كەش و هەوا لە بەرژەوەندی مرۆڤ دا نی یە ، هەروەها زۆرێك لە غاز و هەوای زەرەرمەند بڵاودەبێتەوە ، كە ترسی بۆ مرۆڤ هەیە بە شێوازێكی وا جێگای غازە باشەكان و بە سودەكان دەگرێتەوە .

ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی زۆرێك لە ئەندازەی ئۆكسجین كەم ببێتەوە ، كەوا بوو ناتوانێ بەرگری بكا لەو كەش و هەوایە نوێ یە ، تەنها ئەوەی كە لاشەی زۆر زۆر بە هێز نەبێت ، هەر نەخۆشیەكیش تووشی مرۆڤ بێت بێ توانا دەبێ لە ژیان دا ، بۆیە بڵاوبوونەوەی كەمی ئۆكسجین دەبێتە یەكێك لەو ئافات و

---

[١٦] واتـە : بەرزبوونـەوەی پلـەی گـەرما ... بەڵێ ... پلەی گەرما زۆر بـەرز دەبێتـەوە ، چەند رۆژێك لەمەوبەر واتە : لە ساڵی ٢٠٠٩ لە مانگی شەش راپۆرتێك خوێندرایـەوە كـە خۆم گوێم لێ بوو باسی لە بـەرز بوونـەوەی پلەی گەرمای ئەكرد لە یەكێ لە كەناڵەكانی ئاسمـــــانی و دەیـــــووت : لەســـــاڵی ٢٠٠٩...هـەتاكو ساڵی ... ٢٠١٥ ، ساڵانە نزیكـەی (٣٠٠٠٠) هـەزار كـەس دەمرێـت بـە هۆی بەرزبوونەوەی پلـەی گـەرمایی لەسـەر ئاستی جیهان ، چونكە گەرمیەكـە ئەوەنـدە زۆر دەبێ لە سـنووری خـۆی دەردەچێت ، بۆیە ئەمەشیان نیشانەیەكە لە نیـشانەكانی نزیك بوونەوەی هاتنی رۆژی دوایی .
هەروەها چـەند رۆژێكیش لەمەوبـەر واتـە : لەسـاڵی ٢٠٠٩ لـە مـانگی شـەش راپۆرتێـك خوێندرایەوە كە خۆم گوێم لێ بوو لە یـەكێ لـە كەناڵـەكانی ئاسمـانی و دەیـووت : لـە شـاری (رانیـە) دەغـڵ و دانێكـی زۆر ئـاگری تێبەربوو و سـووتا بـە هـۆی بەرزبوونـەوەی پلەی گەرمی .

نەخۆشیانە ، ئەمەش سەردەکێشێت بۆ دەیان هەزار کەس کە ناتوانن خۆیان بگونجێنن لەگەڵ ئەو کەش و هەوایە نوێ یە ، ئەوانەی زیندووشن پێویستە بژین لەگەڵ ئەو کەمە ئۆکسجینەی کەوا هەیە ، بە پێ ی ئەو ڕاپۆرتە کەم بوونی ئۆکسجین تەنها لە ئەمریکا کەم نابێت ، بەڵکو لەسەرتا سەری جیهان کەم دەبێت ، وە یەکێك لە هەرە موشکیلە گەورەکان ئەوەیە هەرکاتێ ئۆکسجین کەمی کرد ئەوا نەخۆشیەکی نوێ پەیدا ئەبێت کە پێشتر نەبووە ، ئەم نەخۆشیەش زۆر تەئسیر دەکات لەسەر دەماغ و فیکری مرۆڤ و سینگ ، وە ئەو منداڵانەی سەر لە نوێوەش دەبن تووشی ئەو نەخۆشیانەش دەبن ، ئەمەش وا پێویست دەکات کە زاناکان ماندووبوونێکی زۆر سەرف بکەن بۆ دیتنەوەی چەند ڕێگە چارەیەك و کوتانێك یان دەرمانی نوێ ، جا بە پێ ی پێوەری زانستی ئەو نەخۆشیە نوێیانە دەبێتە هۆکاری ئەوەی خێرا ئەو مرۆڤە بمرێت ، یان پاش ماوەیەکی کەم بمرێت . ئەوەی کە لە هەمووی گرنگترە ئەوەیە کە ئەو نەخۆشیە نوێ یانە زۆر زۆر ترسناك ترن لەو نەخۆشیانەی کە لەو سەردەمەدا زۆر بڵاون وەك و ئایدز ، بە پێ ی ئەو نەخۆشیە نوێیانەی کە بڵاودەبێتەوە لە جیهان ، بۆیە ئەوانەی کە تووشی نەخۆشی ئایدز بووینە زیاتر ئەمەلی چاك بوونەوەیان هەیە ، نەك ئەوانەی تووشی ئەو نەخۆشیە نوێیانە دەبن.

بەرزبوونەوەی پلەی گەرما و ئەو گۆڕانکاریانەی بەسەر دادێت

ئەو ڕاپۆرتە دەڵێت : بەرز بوونەوەی پلەی گەرما لەگەڵ ئەو گۆڕانکاریانەی کەش و هەوا و ڕژانی باران ، بە پێ ی ئەو دیاردەیە ئەمە سەردەکێشێت بۆ ئەو جۆرە نەخۆشیانە ، کەوابوو ڕژانی ئەو بارانە تەنها ترسی بۆ ئەوروپا و ئەمریکا پەیدا ناکات ، بەڵکو ترسەکە بۆ هەموو جیهانە ، چونکە چەند بایەکی نوێ دێت ئەو بارانە دەگوازێتەوە لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تر لەسەر ڕووی زەوی ، بەڵام چ دیاردەیەك وادەکات کە جیهان بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ تەئسیر لەسەر زەوی بکەن ، ئەو ڕاپۆرتە دەڵێ : پەیوەندیەکی ئاڵ و گۆڕ هەیە لەسەر ئاسۆیەکی کەونی بوونەوەر ، کە دەسەڵاتی مرۆڤی تێدا نی یە ئەم پەیوەندیەش لەگەڵ ئەوەی کە هەیە لەسەر زەوی . بەڵام هەندێك ڕووداویش ڕوودەدەن کە مرۆڤ دەسەڵاتی تێدا نی یە و پەیوەندی بە یەکتریشەوە هەیە . جا ئەنجامی ئەو پەیوەندیە لە بەینی ئەو دوو دیاردەیە (طاقة معتمة) پەیدا دەبێت ، بە پێ ی ئەنجامەکانی توێژینەوەی زانستی ، ئەم جیهانەی کە ئێمە تیایدا دەژین لەگەڵ هەسارەکانی تر بە شێوەیەکی فرەوانتر ، تووشی تەقینەوەیەکی ناوەکی نابێت هەروەك و زاناکان پێشتر تێی دەگەیشتن ، چونکە ئەوان دەیانووت : کۆتایی جیهان بەوە دەبێت کە زەوی دەتەقێتەوە ، یان دەیان ووت : هەسارەی زەوی وەك و شتی تر کۆن دەبێت و پیر دەبێت ، هەر شتێکیش پیرو لاواز بوو دەمرێت و لەناو دەچێت و ، ژیانی مرۆڤیش لەگەڵ لەناو دەچێت ، جا بە پێ ی ئەم ڕاپۆرتە (طاقة معتمة) زەوی دەپارێزێ ، چونکە ئەو (طاقة معتمة) وەك و دیوارێکی ئەمین وایە بۆ زەوی ، بۆیە ئەو (طاقة معتمة) ئاوا بە دەردەکەوێت کەوا زۆر زۆر بێ سنوورە[17] .

هەروەها ڕاپۆرتەکە دەڵێت : بە هەر حاڵەتێك بێت چەند زانست بەرەو پێش بچێت ناتوانێت ئەو (طاقة معتمة) لەناو ببات ، هەروەها ڕاپۆرتەکە گەیشتە ئەو ئەنجامە زانستی یەی کە ئەو (طاقة معتمة) هەسارەی زەوی دەپارێزێ لە لاچوون و مەداری جێگای خۆی کە دەسوڕێتەوە ، یان ئەو تایبەتمەندیانەی کە هەیەتی کە پلەی

---

[17] واتە : سنووری دیاری کراوی نی یە .

گەرماتی مرۆڤ بە پێ ی ئەو تایبەتمەندیانە دەژین .

وە هەموو گەردیلەکانی ناو ئەو (طاقة معتمة) ووزەیەکی ساکینە[18] ، بۆیە ئەو کپی و بێ حەرەکیەی ئەو گەردیلانەی ناو (طاقة معتمة) وا دەکات کە زەوی بە جوانترین شێوە بسوڕێتەوە لە مەداری خۆی و لانەدات ، چونکە ئەگەر لە مەداری خۆی لایدا ئەوە سەر دەکێشێت بۆ لەناوچوونی ، ئەگەر خواریش بێت ئەوا شەو و ڕۆژ درێژ دەبێت ، یان هەندێك جار ئەو لادانە لە مەداری خۆی سەر دەکێشێتە ئەوەی لایەك ببەستێت و لایەکیش گەرم بێت ، بەڵام ئەو (طاقة معتمة) و ئەو گەردیلانە لێ ناگەڕێت .

بە پێ ی ئەو ڕاپۆرتە حەرەکەی زەوی جێگیرەو ناگۆڕێت کە لا بدات ، ڕاستە بناغەکەی ئەگەر بگەڕێتەوە سەر گەردیلەی ئەو (طاقة معتمة) کە حەرەکە ناکەن و ناجولێن ، بەڵام لە دوای ئەویش گاقەیەکی زۆر زۆر بەهێز هەیە کە ئەو هاوسەنگیەی ڕاگرتووە ، ئەم طاقە گەورەش ئیلا دەبێ چاودێری خوایی بێت .

تێبینی ئەوەش کراوە کە لە سەرەتای ساڵی (٢٠٠٣) کە بە ئاسۆیەکی زۆر زۆر بەهێز و نوێ لاچووە[19] ، ڕاستە ئەو بەشانەی دەورو بەری زەوی بە کەمی دیارە ، بەڵام ئەگەر حیسابی زەوی بکەین چەند هەزار کیلۆمەتر دەکات ، بەڵام بە حیسابی کەونی لەوانەیە لەچاو هێزی خۆی کەم بێت .

وە پەیدابوونی ئەو دیاردە نوێ یەی کە (انحسار جزئی) پێ دەوترێت ، بە پێ ی ئەنجام و زانستی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو گەردیلانەی کە ناجولێن دەستیان بە جولان کردووە ، دەبێ ئەمەش ئەنجامی جولان بێت ، جا بە حەرەکە کەوتنی ئەو گەردیلانە بەدیلەکەی تەنها زەرەردانە بە هەسارەی زەوی ، کەوابێ (معارضه) لە بۆ ئەوەی کەوا زۆر بە توندی بهەژێتەوە لە ئەنجامی پێك دادانێکی زۆر بە هێز لە نێوان بەشێکی ئەو (طاقة معتمة)یە و هەسارەی زەوی .

تێبینی ئەوەش کراوە کە بە حەرەکە کەوتنی(طاقة معتمة) لە زاویە و قوڕنەی لای زەوی ئەمریکی و ئەوروپیە و ، دووریشە لە مەنطیقەی (متوسط) ، بەڵام زانایان دووپاتیان نەکردۆتەوە ئایا پێك دادانی زەوی هەموو دەهەژێتەوە یان بەشێکی ؟

هەندێك دەڵێن : بەشێکی بەهێز تەئسیری لێ دەکات لە چوار چێوەی زاویەی دەوڵەتە ئەوروپیەکان ، بەڵام ئەو ڕاپۆرتە ئاماژە بۆ چەند جێگایەکی گرنگ دەکات کە زیاتر ئەو ڕژانە ئاویەی لێ ڕوودەدات و (٤) هێندەی خۆی زیاد دەبێت ، بۆیە ئەم ئاوەش ژمارەیەکی زۆر لە ووڵاتە ئەوروپیەکان و غەربیەکان نقوم دەکات ، جا مستەوای ئاوەکە ئەوەندە بەرز دەبێتەوە تا وای لێدێت خەڵکی مەنطیقەکە بە ناچاری ئەو ناوچەیە بەجێ بهێڵن و بڕۆن ، وە چاوەڕێ ی ئەوەش دەکرێت کە دەریاچەی ناوەڕاست[20] تووشی ئەم هەڵقوڵانی ئاوە بێت و ئاوێکی زۆری لێ بکەوێت و زیاد بکات .

ئەو هەڵقوڵان و زیاد بوونەش زۆر لە ووڵاتەکان تووشی زیادبوونی (إنهمار المطري) دەبن ، ئەو (إنهمار المطري) یەش چەند شارێکی گەورە بزر دەکات ، بەڵام تەنها ئەوە نی یە کە تەئسیر لە ئەوروپا بکات ، بەڵکو شتی تریش هەیە کە تەئسیری لێ دەکات ، یەکێك لە شتە ترسناکەکان کە تەئسیر لە ئەوروپا دەکات وای لێدێت کە بەفرو شەختەیەکی وا دەبەستێت کە زۆرێك لە ووڵاتە ئەوروپیەکان تووشی دەبن ، هەتا وای لێدێت بەریتانیا وەك و سێبیریای[21] لێدێت بەردەوام دەبێتە شەختە و بەری نادات بتاوێتەوە ، بە پێ ی ڕاپۆرتەکە ئەمەش لە (٢٠) ساڵی داهاتوودا ڕوودەدات ، ئەمەش سەردەکێشێت بۆ ئەوەی دابەزاندنێکی زۆرێکی بە کۆمەڵ لە

---

[18] واتە : بێ حەرەکەیە .

[19] واتە : ئەو طاقەیە کەم بووەتەوە .

[20] دەکەوێتە نێوان ئەوروپاو ووڵاتە عەرەبیەکان .

[21] لەسەرەوەی ووڵاتی ڕووسیایە .




وولاته ئەورووپییەکان له بۆ زۆرێك له وولاتەکانی جیهان ڕووبدات .

جگه لەوەی موشکیلەی هەره گەورەی ترسناك ئەوەیە وەك و ڕاپۆرتەکه دەڵێت : جیهان ئێستا بارگەیەکی زۆری هەیه له چەکی ئەوەوی و هەڵی گرتووه ، جگه لەوەی هەر چەندە ئەو چەکانه بەکار نەهاتووه ، ئەگەر تەوەقوی ئەوەی بکەی که شەڕێکی چەکی ئەوەوی ڕووبدات و ئەو وولاتانەی که چەکی ئەوەویان هەیه ، لەو کاتەدا ئیشەکه زۆر زۆر ترسناك تر دەبێت ، بۆیه چەند حاڵەتێکی نوێمان بۆ به دەردەکەوێت له ترسناکی جیهانی .

به پێ ی ئەو ڕاپۆرته ئەو گۆڕانکاریەی کەش و هەوایە توندەی که ڕوودەدات ، یان ئەو هەستان و زیادبوونەی دەریاو زەریاکان وای لێدەکات ئەو چەکانەی که هەڵگیراوه هەمووی تێك بدات ، چونکه ئەو ئاوه ئەگەر زۆر بوو ئەچێته ناو چەکەکان و تێکی ئەدات ، ئەوەش وادەکات که وولاتەکانی جیهان خۆیان دەرباز بکەن لەو چەکه نەوەویانه ، چونکه به هەر وەسیلەیەك بێت ئەوا ژمارەیەکی زۆر لەو چەکه نوێیانه تێك دەچێت و له کار دەکەوێت ، هەتا وای لێدێت چەکی نەوەوی لەکار دەکەوێت و تیشکەکانی بڵاودەبێتەوه ، کاتێك بڵاوبوویەوه لەسەر زەوی لەوانەیە هەندێك خەڵکی تووشی کوشتن بکات و ، هەندێکیشیان تووشی نەخۆشی بکات[22] .

وه مەلاییینی خەڵکی تووشی ڕووداوی گەورە دەبن ، بۆیه چەند ئەنجام و شوێنەوارێکی تری دەبێت ئەو گۆڕانکاریانه .

ڕاپۆرتەکه دەڵێت چەند نەخۆشیەکی نویَ ئەو گۆڕانکاریانه پەیدای دەکات ، له پێش هەمووشیان نەخۆشی ئەنفەلەونزایە که پەسیوێکی زۆر ترسناکه ، هەروەها بڵاوبوونەوەی برسیەتێکی زۆر لەسەرتاسەری جیهان ، ئەمەش له ئەنجامی ئەوەی زۆرێك له وولاتانی ئەمریکا تووشی (إنهمار المطري) دەبێت و زۆر لەشاره ئەورووپییەکان نوقمی ژێر ئاو دەبن .

بۆیه برسیەتی نێو دەوڵەتی ئەمریکی دەبێته شتێکی جێگر ، دەگاته سنورێکی وا ئەو خواردنەی که له جیهان هەیه بەشی سێیەکی خەڵکی سەر ڕووی زەوی ناکات و ، دوو لەسەر سێ ی خەڵکی سەر زەوی خواردنیان بەش ناکات و نامێنێتەوه

---

ڕوسیا ، دەتوانێت به نیو کاتژمێر زیاتر له نیوەی زەوی له نەخشه ڕەش بکاتەوه . هەروەها دەڵێت : ئەگەر بوو به جەنگی جیهانی به ماوەی نیو کاتژمێر نیوەی ئەمریکا له نەخشه ڕەش دەکەمەوه، بۆیه سەرانی سەربازی وەزیری دیفاعی ئەمریکا (پنتاگون) وا بیر دەکەنەوه که جەنگی ئەم جارەیان تەنیا (چەکی بۆن) نی یه ، بەڵکو چەکی دەنگەو بەس .

[22] هەر هەموو گۆڕانکاری و پێشکەوتنی ئادەمیزاد بە ئەندازەی ئەوە نی یه که لەوەدەکانی چەکی بەکۆمەڵ کوژی له (قەوارەی تۆقێنەری زایۆنیی) و ئەمریکاو

ئەمەشیان چەند ئەنجامێکی دوەلی لێ پەیدا دەبێت و شارستانیەتی مرۆڤ لەناو دەبات و جیهان تووشی ووشکایەتی دەکات ، ئەم هۆکارەش یەکێکە لە ئەنجامەکانی بڵاوبوونەوەی برسیەتی ، ئەو وشکاتیە و ووشکە سالیەش تووشی بەشێکی زۆری سەر رووی زەوی دێت[٢٣] .

راپۆرتەکەش پێش بینی ئەوە دەکات کە ئەو باردۆخانە سەر دەکێشێتە ئەوەی ئەو حاڵەتە نوێیانە پەیدا بێ لە تەهدید کردن و دوژمنایەتی کردن و شەڕ بوون ، بۆیە زۆرێك لە وولاتەکان تەعەدا لە وولاتە دراوسێ کانیان دەکەن بۆ ئەوەی چەند سەرچاوەیەکی خۆراك و ئاویان بە دەست بکەوێت ، یان هەندێك ووزەی بەشەری بە دەست بکەوێت بۆ حەلکردن و چارەسەرکردنی هەندێك موشکیلە کە تووشی ئەو وولاتانە دەبێتکەوابوو ئەو وولاتانەی کە چەکی ئەوەویان هەیە دەتوانن چاودێری خۆیان بکەن و ناکۆکیەکان بۆ بەرژەوەندی خۆیان کۆتایی پێ بهێنن[٢٤] .

بۆیە ئەو گۆڕانکاریانە وا دەکەن چەند وولاتێکی نوێ پەیدابن وچەند وولاتێکی تریش لەناو بچن ، یان ئەو وولاتانەی ئێستا هەیە فرەوان تر بێت و چەند وولاتێکی تر داگیر بکرێت و فرەوانی بکات ، یان لە ئەنجامی کۆتایی ئەو موشکیلانە ئەو گۆڕانکاریانەی کە تووشی خەڵکی دەبن و ، ئەو حەڕەکە نوێیانەی کە تووشی زەوی دەبێت ، یان پێك دادان لەگەڵ هەسارەکانی تر ، هەروەها لە ئەنجامی جوڵانی (طاقة معتمة) کە تووشی زەوی دەبێت لە چەند بەشێکی ئەساسی و سەرەکی دا[٢٥] .

[٢٣] هەر هەموو کۆشکی هەوریرو تەکانەکانی پێش کەوتن و داهێنان بە قەد ئەوە نییە کە زیاتر لە (٣٠) ملیۆن ئادەمیزاد لەم زەمینە برسی یە ، وەزیاتر لە (٢٠) ملیۆنیش بێ کارە و بێ دەرمانە .

[٢٤] واتە : ئەو وولاتانەی کە چەکی ئەوەویان هەیە دەتوانن زاڵ بن بەسەر وولاتەکانی ترداو سەرچاوە ئاو و خۆراکیان لێ داگیر بکەن و دەسەڵاتیان هەبێت بەسەر هەموو جیهان .

[٢٥] گۆڤاری ئۆبزێرڤەری بەریتانی ، لە سایتی ئینتەرنێتی (الملتقى السوري) وەرگیراوە .

# سەیری لاشەی خۆت بکە

**م/ پەیمان**

بیر لە جگەرت یان زراوت یان پەنکریاست یان هەرس کردنت بکەرەوە، سەیری بینین کە ((٩٠٪)) لە مەعلوماتت لە بینینەوە دێت، ((١٦٠٠)) هەزار و شەش سەد دەنگ جیائەکەیتەوە بە ئامێری گوێ.. ئەو دەنگە ئەکا بە کارەبا و خەزنی ئەکا..چاو ئەو ڕەنگە ئەکا بە کارەبا و خەزنی ئەکا، کەی ویستت جوابت ئەداتەوە لە مێشکتدا کۆی ئەکاتەوە، هەر خانەیەك لە لەشدا ((١٠٠)) هەزار ملیۆن)) خانەیە، کامی ئەگری ئەو کرۆمۆسۆماتەی تیایە ئەو جیناتەی تیایە هەموو هۆکارەکانی بۆماوە لەوێدا تۆمار کراوە، واتە هەموو خانەیەك لەو ((١٠٠)) هەزار ملیۆنە تۆیت.. هەموو خانەیەك تۆیت و خۆتیت. لەبەرئەوە پێویستە بزانیت کە ئینسانی عاقڵ کردارێك ناکات کە هەدەفێکی نەبێت و لەبەر ئاواتێك نەبێت هەموو کارێکی خواحکمەتی تیایە، مەرجیش نییە ئێمە هەمووی تێ بگەین، وەکو خلقی خوا حکمەتی تێدایەو

هەندێکی بۆمان دەرئەکەوێ ئاوا بە سەرزارەکی تەماشای کۆرپەلەیەک ئەکەیت لە سکی دایکیدا ((دوو دەست و دوو قاچ



و زمان و گوێو..)) باشە ئەمانەی بۆچی پێ داوە لە ڕەحمێکی داخراودا؟! قاچی بۆچییە؟ خۆ ناڕوات دەستی بۆچییە؟ خۆ نایجوولێنێو بەکاری ناهێنێ؟ دەمی بۆچییە؟ خۆ خواردنی پێ ناخوات؟ بە ئامادەیی لە ناوکیەوە بۆی دێت. بەڵام پاش کەمێك بیرکردنەوە بۆت دەرئەکەوێت کە ئەمانە بۆ قۆناغێکی دیکەن.

ئەمانە بۆ دەرەوەن کاتێکیش کە دێتە دنیاوە هەست ئەکەیت کە ئەو هەست و خۆشەویستیەت و شعورت هەموو دنیا پڕی ناکاتەوە. ئەبێ تێ بگەیت ئەمە دانراوە بۆ عالەمێکی تر بۆ قۆناغێکی تر.

مردنەکەش حکمەتی تێدایە نەك هەر خەلقەکە..

مردنیش جۆرێکە لە خلق، ((خلق الموت والحياة)) الملك / ٢. هەر ئەو پەنجانەی خۆمان کە لە سکی دایکماندا بوین پێستێك هەبوو پەنجەکانی ئەبەست بەیەکەوە، کاتێ دێت وورده وورده نامێنێ مردن ڕوودەدات هەر لەو چرکەیەوە، هەموو سەعاتێك ئێمە ((٦٠)) ملیۆن خانەی خوێنمان دەمرێ، بەڵام هی نوێ دێتەوە شوێنی.. بە ملیۆنەها خانەی پێستمان ئەمرێ بەڵام دێتەوە شوێنی، مردن بەشێکە بۆ بەردەوام بوونی ژیان، حکمەتی تێدایە هەوڵ بدەین تێی بگەین..

حاڵەتی دروست بوونی چاڵەکە بۆ چاو، وە ئەو کونانە بۆ گوێ ئەمانە هەمووی نموونەن بۆ مردن هێشتا کۆرپەلەکەش دروست نەبووە، بۆیە خانەی تر دێتە شوێنی، ئەمە بەرنامەیەکی ئاڵۆز و گەورەیە.. مەگەر هەر خوای گەورە پێی بزانێ هەروەها زیندوکردنەوەشمان حکمەتەکەی لەوە کەمتر نییە، جا تکامان وایەئەو کەسانەی لەو قەیرانەدا دەژین، لەو خولگەی بێ باوەڕیو کەم باوەڕیو گومانەدا دەژین، کە ئیتر ویستی ئازادی خۆیان بەکاربهێنن بەتایبەت بۆ قورئان، اعتصامی پێ بکەن، هەوڵ بدەن لێی تێ بگەن وەڵلاهی بەختەوەری دنیاو قیامەتی مرۆڤ لەم قورئانەدایە..

وە لە کۆتاییدا داوای خێر و ڕەحمەت ئەکەم بۆ هەمووان.



# دایکی صەلاح الدین

م/ طاریق نانەکەلی

خوێنەری سەنگین

دایکی صەلاحەددین ناونیشانی بەرنامەیەکی بانگەوازی ئیسلامی عەمر خالیدە لە بەرنامەی "المجددون" کاتێك هەڵسا بە بەشەداری کردنی ڕێژەیەك لە کچان لەو بەرنامەیە، پرسیارێکی زۆر گرنگی ئاڕاستە کردن (ئایا پاش ئەوەی گەورە بوون دەتانەوێ ببنە چی؟ هەر یەکە وەڵامێکی دایەوە بەڵام ئەوەی جێگای سەرنج بوو یەکێك لەم کچانە وتی دەمەوێ ببمە دایکی صەلاحەددینی ئەیوبی ئەم وەلامە کاریگەری لە سەر عەمر خالید و گوێ گرانی بەرنامەکە کرد چونکە بەڕاستی لەم سەردەمە کچی وا بێت ئاوا مەردو موسڵمان هەبێت و بیر لەوە بکاتەوە ڕۆڵەی وەك صەلاحەددین پەروەردەکا ئەمە جێگای شانازی یە، هەست کردنە بە خەمخۆری بۆ دینی ڕاستی خودا بۆیە دڵەکان لە بەرامبەر وەڵامی ئاوا بە جورئەت هەست بە ئارامی دەکات و گوێچکە لە خۆشیان باڵ دەگرێت.

بەڵێ خۆشەویستان ئەگەر ئاوڕێك لە مێژووی پڕ سەروەری ئیسلام بدەینەوە چەندان نمونەی ئەو جۆرە خاتونەمان زۆرە (خاتوو خەدیجە دایکی ئیمانداران عائشە خان و فاطیمة کچە خۆشەویستەکەی پێغەمبەر و خەنساو رابیعە ی عەدەوی چەندانی تر کە پێغەمبەریان(ﷺ) گرتوە دڵی دایکی گەورەی ئیماندارانیان خۆش کردووە و لەم لاوە فاتیمە خان(رەزای خوای لێبێت)دڵخۆشە کە خوشکی وا بە شەرەف و باوەری هەیە.

خوێنەری سەنگین:-

ئافرەت لە مێژووی ئیسلام ڕۆڵی سەرەکی بینیوە هەر لە دڵدانەوەی پێغەمبەر(ﷺ) لە لایەن خاتوو خەدیجە(رەزای خوای لێبێت) و تا بەری جەنگ ئافرەتان شان بە شانی پیاوان ڕۆڵیان بینیوە بەڵکو ئافرەت ڕۆڵی وای بینیوە پیاو خەونیشی پێوە نەبینیوە با بە یەکەوە چەند نمونەیەك هەڵبژێرین:-

١-لە غەزای ڕۆمەکان لەشکری موسڵمانان ٣٠- ٤٠ هەزار کەس دەبوو لەشکری ڕۆمەکان نزیکەی دوو سەد هەزار دەبوو، کاتێك شەڕ دەستی پێ کردوو سەرکردەی لەشکری موسڵمانان خالیدی کوری وەلیدبوو(رەزای خوای لێبێت)،لەم کاتەی شەردا کۆمەڵێك ئافرەتی بە جەرگ لە پشتەوەی لە شکری موسڵمانان دەبن، هانی موسڵمانان دەدەن بۆ ئەوەی لە پێناوی خوا بجەنگن سەرکردەی ئافرەتەکان هیندی کچی عوتبە بوو خێزانی ئەبوسوفیان(رەزای خوایان لێبێت)لە دوا لەم سەر بۆ ئەم سەر دەهاتوو دەچوو، هانی لەشکری دەدا، کە خۆ ڕاگر بن بجەنگن ئەم قسانەی هیند زۆر کاریگەری هەبوو ڕووی تێ دەکردن دەی گووت (یا حماة الاسلام أین تفرون ام الجبة تفرون) بۆیە زوبەیری کوڕی عەوام دەی فەرموو: (و الله ما کان الروم أشد علینا من نساء المسلمین) دەی گووت ڕۆمەکان ئەوەندە کاریگەریان لە سەرمان نەبوو بەڵام قسەی ئەم ئافرەتە زۆر کاریگەری هەبووە بووەهۆی سەرکەوتنی لەشکری موسڵمانان ،هیند ڕووی لە ئەبوسوفیان دەکردو دەی ووت زۆرت کرد دژایەتی پێغەمبەر(ﷺ) هەوڵ بدە بە ئەندازەی دژایەتیەکەت کاری چاکە و جیهاد بکە بۆ ئەوەی بەیانی بتوانی لە ساحەی مەحشەر بە ڕوو سپیاتی بە

خزمـەت پێغەمبـەر(ﷺ) بگـەی، کاتێـك ئەبوسـوفیان لـە جیهـاد چـاوەکی لـە دەسـت دا هینـدی خێزانی ووتـی ئێستا بـۆت هەیـە بلێ شتەکم بۆ خوا کردووە.

خۆشەویستان هەر ئەو هیندە بوو لە غەزای ئوحد کاتێك کافر بوون جەرگی ئیمامی هەمزەی دەرهێنا ئـەمرۆش دەبیـنین چـۆن بـەرگری دەکات لە ئیسلام

٢- ماشیتەی کچی فیرعـەون، ئـەم ئافرەتە خزمەتکاری ماڵی فیرعـەون بوو بە تایبـەت ئاریشگای سـەری کـچی فیرعـــەون بـــوو، کـــەس لـــە فیرعەون زیاتر نەی دەتوانی نـاوی هـــیچ پەرســـتراوێك ببـــا تـــەنها فیرعـەون نـەبی چـونکە دەی ووت مـن خوامـە و خـەڵکی کڕنووشیان بـۆ دەبـرد، بـەڵام ئـەم ئافرەتـە زۆر بوێرانـە و مەردانـە لـە بەرامبـەر گـــــــەورەترین ســــــــتەمکار دەوســــــتێتەوە، وانـــــــەی یەکتاپەرســــــتی پــــــێ دەڵێ و ڕووداوەکـەش بـەم شـێوەیە بـوو: ئـەم ئافرەتـە ڕۆژێـك لـە کـاتی ئارایـشکردنی قــژی کــچەکەی فیرعـەون شـانەکەی لـە دەسـت کەوتـە خـوارەوە و گـووتی(بـسم الله) و هـــەڵی گرتـــەوە کـــچەکەی فیرعـەون ووتـی (بـسم الله) یـانی باوکم چونکە فیرعەون دەی گووت ((انـا ربُكـم الأعلـى)) ئافرەتەکـە گـوتی خـوای مـن و باوکـت "الله" یە کچەکە ووتی من ئەوە بۆ باوکم دەگێڕمـەوە، کـە فیرعـەون ئەمـەی بیـست بـانگی ئافرەتەکـەی کـرد و گـووتی(أو لـك ربـا غـيري) هـیچ خوایـــەکیترت هەیەجگـــە لـــەمن ئافرەتەکە گوتی:بەڵێ خوای من و تـۆ "الله" یـە، فیرعـەون گـووتی باشـە فـەرمانی دا کـە ئاگریـان کردەوە بانگی ئافرەتەکەی کرد بۆ ئـەوەی پەشـیمانی کاتـەوە، بـەڵام ئـەو خاتوونـە وەك شـێر بەرامبـەر ئەم ستەمکارە وەستا،وە دووبارە ووتـی خـوای مـن و تـۆ "الله" یـە ئینجـــا فیرعـــەون فـــەرمانی دا منداڵەکانی بێنن کە چوار منداڵی هـەبوو لـە پـێش دایکـە کـە سـێ منداڵی هاویشتە ناو ئاگر منداڵی چوارەم کە بچوك بوو ووتـی(دایـە گیان ئارام بگرە تۆ لە سەر هـەقی) بۆیـە هـەموویان فـڕێ درانـە نـاو ئـــاگرو ڕۆحـــی پاکیـــان بـــەرەو بارەگـای خـوا بـەرز بـۆوە بـەلام ڕووداوەکە لێرەدا کۆتـایی نایـەت پـــاش هـــەزاران ســـاڵ کاتێـــك پێغەمبـــەر(ﷺ) لـــە گەشـــتی میعراجـدا لـە ئاسمـان هەسـت بـە بـــۆنێکی زۆر خـــۆش دەکـــات دەفەرمووێ: ئەی جبریل ئەم بۆنـە چیە، لە وەڵامدا جبریل فەرمووی (هذه رائحة ماشطة بنت فيرعون) فـــەرمووی ئەمـــە بـــۆنی ئـــەو ئافرەتەی کـە خزمـەت کاری کچی فیرعـەون بـوو کـە سـوتا و بـوو بەدوکـەڵ و خـەڵوز ئـەمرۆ بـۆنی گـولاوی هـەموو ئاسمـانی داگـیر کردووە بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) سەر سام دەبێت و بەم ڕووداوە، ئەمانە شۆخە ژنی باوەڕدارن ڕووداوی وا گەورەیان تۆمار کردووە کە پیـاو خەونی پێوە نەبینیوە.

٣-بـەر لـە مانگێـك لـە ووڵاتـی ئـەڵمانیا کاتێـك کـچێکی میـصری بـە نـاوی (مـەروە شـەربینی) بـە پۆشاکی ئیسلامی دەبێت لەگەڵ ئەڵمانیەکی ڕەگەز پەرست دەبێتە دەمـەقاڵیان ، لـە سەر ئـەوەی ئـەم کـوڕە سـوکایەتی بـە پۆشـاکی ئیسلامی کردبوو ئەم کچە داوای لەســـەر نوســـی ،بۆیـــە کـــوڕە ئەڵمانیەکە کچەکەی لە ناو هـۆڵی دادگـا دایـە بـەر چـەقۆ شـەهیدی کرد،ئەمەش وانەیەکی تری تۆمار کـرد لـە غـیرەت و مەردایـەتی بـۆ دینـی خـوا لـە سـەدەیی بیـست و یـــەك. زۆرن ئـــەو خوشـــك و دایکانـەی کـە بـە ڕۆحـی پـاکی خۆیـــان مێـــژووی ئیـــسلامیان دەوڵەمەند کردووە بۆنەتە مومێك لە شەوە زەنگی تاریك بۆ دایك و خوشکەکانیان، با کچەکانمان لە ســـەر ڕێگـــای ئـــەم خانمانـــە پـەروەردە بکـەین بـەیانی ڕۆڵـەی هاوشـێوەی صـەلاحەددین پـێش کەش بکەن بە ئیسلام.

# رژێمی ئابوری له روانگەیەکی ئیسلامیدا

## پیشەسازی

(١٣)

د. أحمد باليساني

زۆر له ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز باسی پیشەسازی ئەکات و ئاماژه به پێویستی کاری پیشەسازی ئەکات بۆ دابین کردنی پێداویستەکانی ژیان و پاراستنی کومەلگای ئادەمیزاد بەم شێوەی خوارەوه :

١ـ له سورەی تەوبەدا ئەفەرمێت: (وَقُلِ اعْمَلُوا فَسَيَرَى اللَّهُ عَمَلَكُمْ وَرَسُولُهُ وَالْمُؤْمِنُونَ وَسَتُرَدُّونَ إِلَى عَالِمِ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَيُنَبِّئُكُمْ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ (١٠٥)) واته بلَیٚ کار بکەن ، چونکه بزر نابیٚ ، خوا کارەکه ئەبینیٚ و پاداشتی لەسەر ئەداتەوه ، پێغەمبەریش صلی الله علیه و سلم ئەیبینی ٚو شاهیدی لەسەر ئەدات بەچاکه و خراپه وه ، موسولمانانیش کارەکه ئەبینن و شاهیدی لەسەر ئەدەن ، جگه لەوه سود لەباشەکەی وەر ئەگرن خرابەکەی زیانیان پیٚ ئەدات [٢٦].
واته کار کردن جگه له پاداشتی رۆژی قیامەت کەلکو سودی کومەلگای هەیه بۆ دونیا ، ئەمەش هەموو کارێك جگه له کاری پەرستن ئەگرێتەوه ، وەك کاری ئاسایو پیشەسازی و کشتوکالو... شتی لەم جۆره

٢ ـ خوا له سورەی حەدیدا ئەفەرمیٚ: (لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنْزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَنْ يَنْصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ (٢٥)) واته سوێند بیٚ که پێغەمبەرەکانمان ناردووه به موعجیزەو بەلگەی ئەقلی و کتێب و تەرازوی کردەوەکانتانمان لەگەلٚ ناردونه بۆ ئەوەی خەلکان به دادوەری ودروستی هەلسن ، هەروەها ئاسنمان بۆ ناردونه خوارەوه ،که توندو هێزو سودی بۆ خەلکان هەیه ، بۆ ئەوەی دیاربیٚ کیٚ شەریعەتی خواو پێغەمبەرەکانی له پاشمندەدا سەر ئەخا ، خوا بێگومان هێزدارو و سەرکوتووه ... لێرەدا خوا باسی هێزو تێنی ئاسنی کردووه که زۆر پیشەسازی پیٚ ئەکریٚ و چەکو پێداویستی بەرگری لیٚ دروست ئەکریٚ لەگەل ناردنی پێغەمبەرانو کتێبو بەلگەی زانستی ئەقلی ، ئەمەش ئاماژەیه بەوەی که هەر بیرو باوەرو بەرنامەو سستمێکی ژیان ئەبیٚ جگه له هێزی ئەقلی و مەعنەوی هێزی ماددیشی لەگەلا بیٚ بۆ راگرتنو پاراستنی میللەتو بەرگری دوژمنەکانی ئەمەش هاندانه بۆ هەلسان به پیشەسازی جەنگی و هێزی سوپایی .

٣ـ هەروەها خوا له ئایەتێکی تر له سورەی سەبەئدا ئەفەرمیٚ:(وَأَلَنَّا لَهُ الْحَدِيدَ (١٠) أَنِ اعْمَلْ سَابِغَاتٍ وَقَدِّرْ فِي السَّرْدِ وَاعْمَلُوا صَالِحًا إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ(١١)). واته ئاسنمان بۆ داود سەلامی خوای له سەر بێت له سەر بێت نەرم کرد که فەرمانمان پێدا بەرگه و قەلغان دروست بکا ، ئەندازەی بزمار دروست کردن رابگریٚ به شێوەیەکی وا کەلکی پیشسازی هەبیٚ ، کردەوەی چاکه بکەنو خوا بینەری کردنی هەموو کارو کردەوەکانتانه [٢٧] ...بیٚ گومان ئەم جۆره شتانەش بۆ جەنگ بەکار دێن .

٤ـ که حەزرەتی نوح سەلامی خوای له سەر بیچت داوای له خوا کرد بەسەر دوژمنەکانی بخات ، خوا فەرمانی پیٚ کرد که کەشتی دروست بکا له ژێر چاوەدیری و فەرمانی ئەو،خۆیو موسولمانەکان

---

[٢٦] ) تفسير الطبري ١٠\١٢ ، فتح القدير ٤٠٠\١٢

[٢٧] ) الكشاف ٥٨١\٣ . تفسير البيضاوي ٣٩٤\٤ .

سوارى بن و پێداويستەكانو لە هەر جۆرە ئاژەڵێك جوتێكى سوار بكا بۆ رزگار بونيان لە خنكان ئەگەر ئەمرى خوا هاتەجىٚ و لافاو هات[٢٨] ، وەك لە سورەى موئمينوندا ئەفەرمىٚ:( قَالَ رَبِّ انْصُرْنِي بِمَا كَذَّبُونِ (٢٦) فَأَوْحَيْنَا إِلَيْهِ أَنِ اصْنَعِ الْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا فَإِذَا جَاءَ أَمْرُنَا وَفَارَ التَّنُّورُ فَاسْلُكْ فِيهَا مِنْ كُلٍّ زَوْجَيْنِ اثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَنْ سَبَقَ عَلَيْهِ الْقَوْلُ مِنْهُمْ وَلَا تُخَاطِبْنِي فِي الَّذِينَ ظَلَمُوا إِنَّهُمْ مُغْرَقُونَ (٢٧)) .

لێرەدا وا دەر ئەخات كە پيشسازى هۆى رزگاربونو سەركەوتنە.

٥ـ خوا لە سورەى ئەنفالدا فەرمويەتى:( وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدُوَّ اللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ....(٦٠)).واتە بۆ دوژمنەكانتان هێزو ئاميرى جەنگ • (كەلەو كاتدا ووڵاغ بوو ) ئامادە بكەن دوژمنى خواو خۆتانى پىٚ بترسێنن ، هێز لێرە هەمو جۆرە هێزێك ئەگرێتەوە كە پێى لە دوژمن بدرىٚ مييلەتى پىٚ بپارێسرىٚ ، پێغەمبەر صلى الله عليه و سلم فەرمويەتى: ( ألا إن القوة الرمي الا إن القوة الرمي ألا إن القوة الرمي )[٢٩] واتە هێز هاويشتنە هێز هاويشتنە هێز هاويشتنە ، واتە لێدانە لە دوژمن بە هەرجۆرە چەكێك بىٚ بە گوێرەى گۆرانى زەمان بە پێشكەوتنى تەكنيكى ، ئەمەش هەموو جۆرە پيشەسازييێكو و دروست كردنى هەمە چەشنى هێزى ماددى و مەعنەوى ئەگرێتەوە ، كە پێويستە پێى سەركەوين لە گشت بوارەكانى ژيانى كۆمەلايەتيدا[٣٠] .

٦ـ لە سوننەتيشدا وەك لە پێشدا باسمان كرد كە پێغەمبەرصلى الله عليه و سلم مۆرێكى لەسەر شێوەى گوستيلە دروست كرد ، هەروەها مينبەرى لاى دارتاش دروست كرد ، خەلكان لە زەمانى ئەودا كارگەى دروست كردنى هەمە جۆرە شتيان هەبوو پەسندى ئەكرد .

كەوابوو ئيسلام پيشەسازى دروستكردنى پێداويستەكانى هەمو بوارەكانى ژيانى كۆمەلايەتى پێويست كردووە ، واتە پێويستە لەسەر كۆمەلگاى ئيسلامى كارگەى پيشەسازى هەبىٚ بۆ هەمو پێويستێك لە هەمو بوارێكى كۆمەلايەتيو مرۆڤايەتيدا.

لەو ئايەتە پيرۆزانەى ئاماژەمان پىٚ كرد كە باسى تاواندنەوەى ئاسن ئەكاتو فەرمان بە دروست كردنى چەكو پێداويستەكانى عەسكەرى و هێزدارى ئەدات ، وا دەر ئەكەوىٚ كە پێويستە لەسەر موسولمانان پيشەسازى بناغەيى قورس دروست بكەن و بيكەنە كارى سەرەكى و بنەڕەتى پيشەسازيەكانى تر ، نەك بە پێچەوانەوە كە تەنيا كالاى لەناوچوويى ( بضائع إستهلاكية) دروست بكەن كە وايان لىٚ ئەكات پەنا بەرنە بەر ووڵاتەكانى بێگانە بۆ پەيداكردنى چەكو كەرستەى سەرەتايى(مواد أولية) پيشەسازى ئەم جۆرە كاڵايانە ، بەڵكو ئەبىٚ پيشەسازى قورس و دروست كردنى كەرستەى سەرەتايى بكەنە ڕاميارى بنەڕەتى خۆيان نەك تەنيا بە پيشەسازى كالايە كاتيەكانى لە ناو چوو هەڵسن، چونكە هەر دەولەتێك پسشەسازى جەنگى و عەسكەرى نەبىٚ لاواز ئەبىٚ و ئەبێتە ژێر دەستو نۆكەرى بێگانە بە پێچەوانەوە ئەبێتە خاوەن زانستو هێزى خۆى ، گەشە ئەداتەوە و پێش ئەكەوىٚ و سەر ئەكەوىٚ ، دوژمنان ناتوانن دەستى لىٚ بدەن

[٢٨] ) تفسير البيضاوي ١٥٢\٤ ، تفسير السمرقندي ٤٧٩\٢ .

[٢٩] ) صحيح مسلم ١٥٠٢\٣ الحديث رقم ١٩١٧ .

[٣٠] ) الكشاف ٢٢٠\٢ ، التفسير الكبير ١٤٨\١٥ .

بۆیە ئەبینین ئەمریکاو وولاتە هاوپەیمانەکانی،
پیشەسازیەکانی عەسکەری و قورس و زانستی ووردو تەکنیکی قۆرخ (إحتكار) کردووە ناهێڵن



وولاتانی تر پێی هەڵسن یا فێری بن ، هەتا سەرچاوەی زانستو چەکوچی هێزو چارە نووسی گەلانی جیهان هەر بەدەست ئەوان بێتو ، هەر ئەوان خۆیان زاڵ کەن بەسەر وولاتانی تر بە تایبەتی وولاتەکانی موسولمانان . ئەگەر شتێکمان بدەنی بە فرۆشتنیش بەپارەی خوشمان ڕەزیلیمان لەگەڵ ئەکەنو ، ئەم جۆرە چەکو کاڵاو کارگانەمان پێ ئەفرۆشن کە پاش کەوتوەو دەها ساڵی بەسەردا چووە و کەلکی بەرامبەر بوونمان نەبێ لە دژ دوژمنان بە جەنگو لەگەڵ دوستان بە مرۆڤایتی و هاوپەیمانان بە بەرژەوەندی و بەری هیچ نەگرینو زوو بکەوین ، هەر بە هەژاری و بێ هێزی و دەست بەسەری بمێنینەوە ... ئەمەیە بەرهەمی رژێمەکانی سەرمایەداری عەلمانی دیموکراس کە زۆر لە خەلکان بەداخەوە پێ هەڵخەلەتاون و وەرگەڕاون .

کەوابو ئەبێ ئەم شتانەی کە پێویستە دروست بکرێن بۆ بەهێزی و زانست و خزمەت گوزاری ئەبێ وولاتانی ئیسلامی پێ هەڵسن کارگەکانی بۆ دابنێن ، بەڵام ئایا ئەبێ دەولەت پێ هەڵسێ یا تاك ؟ واتە چ کارگەیێك ئەبێ هی تاك بێ و چ کارگەیەك ئەبێ هی دەولەت بێ ؟ بە گوێرەی شەریعەتی ئیسلامی سامانداریەتی کارگەی پیشەسازی (تابیعی) دواکەوتەی سامانداریەتی داهاتە کانی ئابووریە (موارد إقتصادیە) ، واتە ئەگەر داهات سامانی گشتی بوو ئەبێ کارگەکەشی سامانی گشتی بێ بەلاّم دەولەت بەرێوەی ئەباتو سەرپەرشتی ئەکات ، نابێ بیدا بە خەلك یابیفرۆشێ یابیکاتە سامانی تاك ، چونکە ئەمە سامانی گشتییە نابی بگۆڕێ بە هی تاك ، بەرهەمەکەشی بە سەر تاکەکانی کۆمەڵدا دابەش ئەکرێت تەنیا مەسرەڤی ئامادە کردنی لێ وەرئەگیرێ وەکو کارگەی ئامادەکردنو ڕوون کردنەوەو ڕاکیشانی ئاو بۆ خەلکان ، یا کارگەو کۆمپانیای دەرهێنانو پالێوکردنو دابین کردنی نەوتو بانزینو گازو پیشزازیەکانی پترۆکیمیاوی و کارگەی روژووی بەرد(الفحم الحجری) و سوەتەمەنیەکانی ترو هەموو ئەم جۆرە شتانەی کە سامانی گشتییە وەك لە ژمارەی پێشوو دیارمان کردووە ، هەروەها رێگاوبانە گشتیەکان، واتە نابێ یەکێك رێگای گشتی

قیرتاو بکاتو یا سیکەی ئاسنی لێ دروست بکاو شەمەندەفەری تایبەتی تێدا بڕوێنیت کرێ لە خەلکی وەرگرێت ، چونکە ئەمە هی گشتییەو ئەبێ دەولەت سەرپەرشتی بکات و بۆ هەموو هاو وولاتیان وەکویەك بێ کارگاکانی سامانی گشتی نابێت بەرهەمەکەی بفرۆشریتە هاوو وولاتیان بە قازانج ، بەلکو هەروەکو ووتمان پێیان ئەدرێ بە نرخی تێچونی (کولفە )ی خۆی ، بەلاَم ئەگەر پتر بوو لە پێویستی هاو وولاتیان ، زیایەکەی ئەفرۆشرێتە دەرەوەو قازانجەکەی بۆ تاکەکانی هاو وولاتی و بەرژەوەندییان و پێویستەکان و خزمەت گوزاری گشتی خەرج ئەکرێ . چونکە بەرهەمو قازانج مال و سامانی گشتی ئەبێ بۆ گشتی بگەرێتەوە .

ئەگەر داهاتەکەش سامانی دەولەت بوو هەر خۆی بەرێوەی ئەبات و لە بەرژەوەندی وولاتو دەولەتی خەرج ئەکات وەك کارگەی دروستکردنی ئۆتوموبیل وتەیارەو شەمەندەفەرو چەك هەموو ئەم جۆرە شتانەی کە پارەیەکی زۆری ئەوێ بە تاك دابین ناکرێ تەنیا بە کۆمپانیاو کارگەی کە لەسەر بودجەی دەولەت نەبێ ناکرێ [31]، لەبەر دوو هۆ: یەکەم:زۆر زەحمەتە تاك ئەم جۆرە سامانەی هەبێ ، دووەم:هەتا سامانو پارە تەنیا لە دەست دەولەمەندەکاندا نەسورێتەوە وکۆ نەبێتەوە .

چونکە قورئان تایبەتمەندی کردنی خربونەوەو هەلسوڕاندنی پارەو سامان تەنیا لە ناو دەولەمەندەکاندا قەدەغە کردووە بە فەرمودەی لەسورەی حەشردا: (كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاءِ مِنكُمْ...(٧))

هەموو ئەو جۆرە داهاتانەی ئابووری ساماندارییەتی تاکی تیادا دروستە [32]، ساماندارییەتی کارگەکەی لە لایەن تاکەوە دروستو رەوایە ، وەك کارگەی دروست کردنی کوتارو جلو بەرگو کەلوپەلی ناومال کەرستەی خانوو خواردەمەنی و ....هتد .

هـــەر شـــتێکی لـــەلای تاکـــەوە ســـــاماندارییەتی دروســـت بـــێ دەولەتیش ئەتوانێ دروستی بکاو کارگەی بۆ دابنێ و بەرهەمەکەی یـــا قازانجەکـــەی لـــە کاروبـــاری دەولـــەتو بەرژەوەنـــدی وولات بـــــــــــــــەکاربێنێ.

---

[31] ) السياسة الغقتصادية المثلى ص٩٥ فما بعدها
[32] ) المصدر نفسه

**قال رسول الله :**

«عَجَبا لأمرِ المؤمنِ لا يَقــضِي اللهُ لَــهُ قَـضاءً إلا كـانَ خَـيراً لَهُ، إنَّ أصابَتهُ ضَرَّاءَ صَبَرَ فَكانَ خَيراً لَـهُ وَإن أصــابَتهُ سَـرَّاءَ شَكَرَ فَكانَ خيراً لَهُ»

متفق عليه

حـــاڵی بـــڕوادار زۆر جێـی سـەرسـوڕمانە، خوا هەرچی بۆ بڕیار دەدا بـە خێـری تـەواو دەبێت. ئـەگـەر ئـازار و نارەحەتی پێ گـەییشت خۆی ڕادەگرێ و سەبر دەکا و سەرەنجام دەبێ بە خێر بۆی و ئـەگـەر خۆشی و شـادییەکیشی پێ گـەییشت سوپاسـی خوا دەکا و سەرئەنجام ئـەوەش دەبـێ بـەخێـر بۆی

# شێوەکانی هێرشی بیرۆکەیی بۆ سەر جیهانی ئیسلامی

## -بەشی دووەم-



ئا: ملا محسن عبدالله

سوپاس و ستایش بوخودای میهرەبان، هەزاران سڵاو و درووود بۆ گیانی پاکی پێشەوای مرۆڤایەتی و یارانی و شوین کەوتوانی بەچاکە تاکو ڕۆژی هەستانەوە(دوای)خوێنەری بەرێز و خوشەویست، لەژمارە (١٢)ی شەعبانی ١٤٣٠ کۆچی و ئابی-٢٠٠٩ ی زاینی- بەناونیشانی شێوەکانی هێرشی بیرۆکەیی بۆسەرجیهانی ئیسلامیمان پێشکەش کردن بۆ ئەلقەی یەکەم،پەیمانمان پێدان کەوا لە ئەلقەکانی داهاتوو بەووردی ئەمانەتان بۆڕوون بکەینەوە کەوائەم بابەتانەی باسمان کردوون لەخۆئەگرێ جالەبەر گرنگی ئەم بابەتە بەپێویستمان زانی بخەینە بەرچاوی خوێنەری بەرێز هەرجارەی بابەتێك.

ئەم جارە لەبرگەی یەکەم دەست پێدەکەین ئەویش- قۆناغەکانی هێرشی هزر و بیرۆکەی ڕۆژئاوا بۆسەر جیهانی ئیسلامی.

پێشەکی:-

بوونی ڕۆژئاوای مەسیحی لێرە لەرۆژهەڵاتی ئیسلامی شتێکی رێکەوت نەبوو، لەسەرەتاوە دەستی پێکرد بە بوونێکی عەسکەری و ماددی، دوا بەدوای ئەوە هەبوونێکی ڕۆژ هەڵاتی و مزگێنی ((دوای ئەوە دووبارەوجودێکی عەسکەری بەدوای داهات)) ئەویش (داگیرکردن وپارچە پارچەکردنی خەلافەتی ئیسلامی بوو) دوای ئەوە بیرۆکەی جیاکردنەوەی دەوڵەت و وڵات لە ئاینیان هێنایە کایەوە- وەهەروەها بیرۆکەی قەومیەت دوایی هێرشبردنە سەر خەلافەتی ئیسلامی و لاوازکردنی پاشان دوایی ئەوەی سەربازەکانی رویشتن و وولاتی موسڵمانانیان جێهێشت، ئەمانە چەندەها سەربازی تریان بەجێ ما کەوا لە خۆمان بوون و بەزمانی. ئێمە قسەیان دەکرد هەربەوانیش بارودۆخی سیاسەتەکەیان گۆڕا کەوا ئەوان دەیان ویست و ئارەزوویان بوو وە ئەم گۆرانکاریە کۆمەڵایەتییەی ئەیان ویست هاتە دی.

جاخوێنەری خۆشەویست و بەرێز ئەوا ئەمەی بۆم باس کردن لەم پێشەکیەدا ئەکەین بەسێ قۆناغ لەتەوەرەوبابەتەکەی

١-قۆناغی یەکەم:قۆناغی پێش داڕووخانی خەلافەی ئیسلامی

٢-قۆناغی دووەم: قۆناغی- الاجهاز- داڕووخاندنی خەلافەی ئیسلامی- لەلێدوانی دووەم باسی دەکەین إن شاء الله

٣-قۆناغی سێ یەم: قۆناغی پاشی داڕووخانی خەلافەتی دەوڵەتی ئیسلامە-لەلێدوانی سێ یەم باسی دەکەین

لێدوانی باسی یەکەم - المبحث الاول

قۆناغی پێش رومان و داڕووخانی خەلافەی ئیسلامی لە تەوەرەی یەکەمی باسەکە ئەخەینە روو

قۆناغی دووەم : قۆناغی ڕووماندنی ئیسلام لە تەوەرەی دووەم باسی لێوە دەکەین

قۆناغی سێ یەم: قۆناغی پاشی رومانی دەولەتی خەلافەت لە

تـەوەرەو بابـەتى سىٚ يـەم باسـى لێوە ئەكەين

خوێنــەرى بــەرێز لــە باســى يەكەمــدا قۆنــاغى پــێش داروخــانى خەلافــەى ئيسلامى:ئەم قۆناغە دەست پىٚ ئەكات بە باس لەجەنگەكانى خاچ پەرستەكان پاشـان رۆژهــەلاّت ناســـان و پاشـــان مزگێنى((التبشير))

يەكــەم:جەنگــەكانى خــاچ پەرستەكان

مەبەســتمان نوســينى مێژوونيە،بـەلاّم تـىٚ ئەپـەرين بـە كورتەباســێك لــەم راســتيە مێژووييـەى كـەوا دانـى پێـدا ندراوە،لـەم راسـتيانەدا رۆژئـاوا چەندەها هێرشى ئامەدە كرد واتە بــەرپاكرد بۆســەر وولاّتــانى ئيــسلامى بــەناوى خــاچ و لەژێرئالاّكەى،پياوانى كەنيسە لە ئەوروپادا پاشاو گەلەكـەيان هـان ئـەداوپالّيان پێـوە ئـەنان بۆئـەو جەنگە،بــەم جۆرەشــێوەيەكى ئـاينى لـەخۆگرتبوو دووبـەرەكى موسلّمانان و لاوازييان يەكێك بوو لـەم هاندەرانـەى ئـەوروپا كـەوا بتوانىٚ ئەم هێرشانە بكات بۆسەر موســلّمانان. ئەمــەش شــتێكى ڕاست نيە هەندێك لە نوسەرانى عەرەب وانيشان ئەدەن و ئەيخەنە بەرچـاو كـەوا ئـەم جەنگانـەى رۆژئــاوا بــەرپاى كــرد دژى

رۆژهـەلاّت تـەنها چەند هێرشێكى ئيستعماريە لـەدواى بەرژەوەنـدى ئـابورى ئەگەرێت،بـەلّىٚ وادەبێـت ئيستعمارو ئامـانجى ئـابورى تـىٚ دا بێتەجىٚ،بەلاّم ئەوە ئامانجێكى ســەرەكى نيــە بــەلّكو ئــەوە ئامـانجێكى ئاينيـە، بەشـداربونى پياوانى مەسيحى و هاندانيان بۆ ئـەم هێرشـانە شـتێكى هاكـەزاى نــەبوو بــەلاّم ئەمــە تــەنها تۆلّەسـندنەوە بـوو بەرامبـەر بـەم شۆڕشـانەى ئيـسلام كـردى و چووە ناو دلّى ئەوروپا، تاكو واى لىٚ هــات كــەوا دەريــاى سـپى ناوەڕاست بوو بە دەرياچەيەكى ئيسلامى، بە تەواوى موسلّمانان گەيــشتن بەباشــورى فەرەنــسا پاشـان بـەوە نـدەش نەوەسـتان كــەوا تۆلّــە بكەنەوە،هەولّيانــدا موســلّمانان بكـەن بـە مەسـيحى (گـاور) ئـەويش قۆنـاغى دووەمـى ئەم شۆرشەى دىٚ دەى سـەلمێنى .ئـەم كارانـەش فـەرمودەى خـودا لــەم ئايەتــە پيرۆزانــە روونــى ئەكاتـەوە ئامـاژەى بۆئەكات كـەوا ئەفـەرموىٚ ( وَلَـنْ تَرْضَـى عَنْـكَ الْيَهُودُ وَلا النَّصَارَى حَتَّى تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ) (البقرة-١٢٠) واتـە جولەكـەكان و گاورەكـان لێـت ڕازى نـابن ئـەى محمـــد تــاكو بــەدواى بــيرو باوەرەكــــــەيان نــــــــە كەويت.وەهەروەهائەفەرموىٚ (وَلا يَزَالُونَ يُقَاتِلُونَكُمْ حَتَّى يَـرُدُّوكُمْ عَـنْ

دِينِكُمْ إِنِ اسْتَطَاعُوا) (البقرة- ٢١٧) بـىٚ گومـان بـىٚ بـاوەڕان بـەردەوام دژتــان دەجــەنگن هــەتا واتــان لێبكــەن لــە ديــن و ئاينيــشتان پاشــگەز ببنــەوە ئەگــەر بۆيــان بكرێت و بتوانن

وادەبێت ڕاست بێت ئەوەى كاتب و نوسـەرى ئـەمريكى وليـام غـاى قار ئاما ژەى بـۆ كـرد كـەوا جولـە كـەكان لـە دواى شـەڕى خـاچ پەرسـتەكان بـوون هـەر بـۆ لاواز كردنـــى هـــەردوو جيهـــانى مەسيحيەت و ئيسلام ،بۆوەدەست هێنانى زياترلە(سوو)و ربا لـەكات و ميانەى ئەم شەڕە.

ئەمـە كاريگـەرى هـەبوو لەگـەر ئەوەشــدا مەســيحيەت خۆيــان كينەيەكيان لەدلّدابوو بۆ دژايەتى ئيــسلام و داگيركردنــى ولاّت و بەروبووم و سامانى

پاك و خا وێنـى لـەئاينى ئيسلاما بۆ ميللەتە نەوەك بۆ پێشەوا

هەرچـەندە لـەم كاتـەدا دەولّـەتى ئيـسلامى پارچـە پارچـە بـوو خـوداى گـەورە مـو عجيـزەى ئـەم ئاينــەى دا بــە ئومــەتى ئيـسلام پاشـى - قورئـان- چـونكەبەهۆى پـەيڕەوى ئـەم قورئانـە بـوو بـە (باشــترين ئومــەت و ميللــەت) بــەهۆى فــەرمانكردنى بەچـاكەو قەدەغــەكردنى خراپــە هــەروەك ئـەبينين قورئـانى پـيرۆز ئامـاژەى پێكردووە،ئەمـەش ئـەم فـەرمودە

بەناوبانگەئـە سـەلمێنێ كـەوا گـوتراوە (پـاكى لـە ئيـسلاما بـۆ ئوممەتـە نـەوەك بـۆ پێـشەوا) چـــونێك حــــەزرەت (د.خ)ئەفـەرموێ( لا تجتمـع امـتي علـى ظلالـة) واتـە ئومـەتى مـن لەسەرگومڕایی كۆنابێتەوە)دوایی ئێمـە ئـەیبینین لـە میـژوویی ئیسلاما ئەم هەموو ڕوداوە وئێش ئـازارو ئەشـكەنجەی لەگـەر ئـەم میللەتە ئیسلامە خۆڕاگرو بەرزە هاتووە .

سـەرەڕای ڕۆوتـیێ كردنـی تـیرو شـیرو حەربەیـە بـەرەو سـینگ و دڵـی موسـڵمانان كـرا لەلایـەن دوژمنـان و كـافران و ناحـەزانی ئیسلام .ئەم میللەتە ڕاپەڕی كاتێ بینـی كـەوا خـاچ لەسـەر سـەری دوژمنانیەتی ،ڕاپەڕی بەرەو ڕوی دوژمنـــانی خـــوداو دوژمنـــانی ئیـــسلام بـــۆوە بەهـــەموو ڕێگایەكەوە،خوێن و گیانی خۆی زۆر لـەلا هـەرزان بـوو بەرامبـەر بەفـەرمانی خـوداو سـەركەوتنی بەرنامەكـەی و ووشـەی خـودا خێـرای ئـەكرد بـۆ گەیـشتن بـە بەهەشـتە پـان و بەرینەكـەی و خـــودای میهرەبـــانی،خوداش دووبەشی گرنگی پـێ دان یـەكیان سـەركەوتن وە یـاخود بەهەشـت هێرشـــەكانی خـــاچ پەرســـتان شكستی هێنـا یـەك لـە دوای یـەك پـاش جـەنگێكی خوێنـاوی كـەوا بۆماوەی دوو سەدە بەردەوام بوو، لـــە چـــیرۆ كـــەكانی میـــژوویی پاڵـــەوانانی موســـڵمانان لـــەم جەنگانەدا و زیرەكی و لێهاتوویی و شـارەزایەكانیان پێویـستە بـە پیتی زێڕ بنوسرێنەوە.

بۆ نموونـە لـەم پاڵەوانانـەی كـەوا مێـژوویی ئیـسلامیان ڕوونـاك كـــردەوە بـــەم شـــكۆمەندیەی نوانـــدیان وەكـــو نورالـــدینی شـەهید(محمـودی كـوڕی زەنكـی تـوركی)پاشـان پێـشەوای بـەناو بـــانگ و ئازادكـــاری (قودســـی پـــیرۆز)صـــلاح الـــدینی الأیـــوبی كوردی،وەبێجگـە لەمانـەی كـەوا میللەتیان بەرەو سەركەوتن برد، بۆســـەلماندنی جیهانیـــەتی ئـــەم ئاینـــــەو بانگەوازەكــــــەی و یەكـسانیەتی بـۆ گـشت مرۆڤـی سەرزەوی هـەروەك چۆن حـەزرەت (د.خ)فەرموویـەتی ( لافضل لعربـي علـى اعجمـي) و نـا ردنـی ئـەم پێغەمبـەرە (د.خ)بەڕەحمـەت بـۆ گـشت ئـادەمیزاد بـێ جیـاوازی و چـەندین ئایـەت و فـەرموودەی پـیرۆز لـەم بابەتـە بـۆ سـەلماندنی ئـەم ڕاسـتیە ئەگـەر لاپـەرەكانی میژوو هەڵدەینەوە ئەبینین هـەموو میللـەتان بە شداریان كـردووە لـە پاراسـتنی ئـەم ئاینـە پـیرۆزە بـە كوردو عـەرەب و فـارس و تـورك و غـەیری ئەوانـەش بـۆ نمونـە جـــەماوەری توركـــستانی خـــۆ شەویـست (كـەوا ئەرزایـەوە لـەژێر گـــــومرایی شـــــیوعیەتی لەخودانەترس و تاوانبار) و ئازاد كردنیـان بۆخـاكی ئیـسلام لـەو لەشكرە زلهێزانـەی خـاچ پەرسـتە كین لە دڵەكان.كەس نـەبوو پشتی موسڵمانان بگرێت كاتێ روسیای شیوعی (٣)سـی ملیۆن موسلمانی تـوركی كوشـت و لـەناوی بـردن (اعدامی كردن)

دوا بـــەدوای ئـــەوە ڕۆژئـــاوای مەسیحیەت بۆی روون بۆوە ئەگەر هەرچـەندە دەوڵـەتی موسـلمانان لاوازبێت ناتوانی هیچیان لێ بكات و هـــیچ لـــە بـــیرو باوەڕەكـــەیان بگۆڕیـت.خوێنـەری بـە ڕێـز لـە سـەرەتاوە گوتمـان ئـەم قۆناغـە بەسی قۆناغ تێ ئەپەڕی . ئەوەی باسمـان كـرد یەكـەم بوو،قونـاغی شەرو جەنگ .

قونـاغی دووەم دێـت :بەیارمـەتی خــودا باســی لێوەدەكــەین لــە ژمـارەی داهـاتوودا ئـەویش :ڕوژ هەلات ناسیە .لەدوای ئەو قوناغی مزگینی واتە (الحرب ثم الاستشراق ثم التبشير)

لـــە خـــودای گـــەورە داواكـــارم هـەموومان ببەخـشێت بـە میهـرە بانی خۆی و سـەركەوتومان بكـات لە دنیاو ڕۆژی هەڵسانەوە.

وآخـر دعوانـا ان الحمدللـه رب العـالمين والصلاه والسلام امام المـتقين الـسلام علـى وعليكم وعلى المسلمين أجمعين

# القسم العربي

## برنامج دعوي خلال شهر رمضان

نمـــــــوذج (١)

١- درس في القرآن الكريم خاص بالكبار في السن ، عن طريق حلقة يومية خلال رمضان يهتم فيها : بتصحيح التلاوة ، ومراعاة أهم أحكام التجويد كالإظهار والإدغام والإقلاب والإخفاء والغنة والمد .. ، ويفضل أن يكون الفاتحة و جزء عمّ وتبارك ، مع حفظ من الناس إلى الزلزلة – فأكثر إن تيسر. مع حفظ آية الكرسي وخواتيم سورة البقرة وأذكار الصباح والمساء .

٢- درس آخر في القرآن الكريم للصغار ، ويركز فيه على القراءة الصحيحة ، مع حفظ من الناس إلى الشمس – على الأقل ، مع حفظ آية الكرسي وخواتيم سورة البقرة وأذكار الصباح والمساء .ويحض الناس على حضور أبنائهم ومشاركتهم حتى تعم الفائــــــدة .

٣- كلمة يومية عن أحكام الصيام ، تعتني بالتعريف بمقصد الإسلام من مشروعية الصيام ، وبعض الحكم في ذلك ،وذكر بعض الفوائد الطبية الثابتة من الصيام .والتعريف بأهم الأحكام التي يحتاجها الناس في صومهم ، ويتطرق للقضايا المعاصرة : كسحب الدم ، واستخدام الإبر المغذية وغير المغذية ، وبخاخ الربو ونحوها

٤-درس آخر في مواضيع عامة : كبعض القضايا في مسائل العقيدة ، أو القضايا الأخلاقية ، أو أمور غفل الناس عنها ، أو عبادات قصروا فيها . والأفضل أن يدرس كتاب الدروس المهمة لعامة الأمة لابن باز حفظه الله فهو شامل لها ، ويختار الوقت المناسب لمثل هذا الدرس كعقب إحدى الصلوات المفروضة ، بما لا يتجاوز عشرين دقيقـــة يوميـــاً .

٥- إعداد إفطار رمضاني كامل أو المشاركة فيه في المسجد ، ودعوة الناس لحضوره والمشاركة فيه ، وخاصة الفقراء ، والمحتاجين .مع الحرص على بث روح المحبة والمودة والأخوة ، وتعليم الناس الآداب النبوية في الأكل والشرب عامّةً ، والآداب الخاصة بالصوم مثل : تعجيل الفطر ، البدء بالتمر فإن عدم فالماء ...الخ .

٦- إقامة صلاة التراويح بالناس وتخصيص مكان للنساء ، مع مراعاة الناس وحال أهل البلد ، وعدم الوقوع معهم في خلافات

